# یەک کاتژمێر گفتوگۆ لەگەڵ
# پێغەمبەری ئازیز

صلى الله عليه وسلم

ناوی كتێب: یەك كاتژمێر گفتوگۆ
لەگەڵ پێغەمبەری ئازیز ﷺ

نووسەر: ئەحمەد گوربوز

وەرگێڕ: شادان ئاكۆ علی

پێداچوونەوە: دڵپاك قادر، بەهرە محمدعلی

تیراژ: ( ٣٠٠٠ )دانە

نۆبەی چاپ: یەكەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارە ( ٢٠٠٢ )ی ساڵی ٢٠١١ ی پێ دراوە



هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیاندنێكی كوردیی ئیسلامیی هاوچەرخ

ناونیشان: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100
0750 106 9589
0748 013 4669

ara.m@hotmail.com

# یەك كاتژمێر گفتوگۆ لەگەڵ
# پێغەمبەری ئازیز

ﷺ

## ئەحمەد كوربوز

و: شادان ئاكۆ

چاپی یەكەم ١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز

## باشترین مرۆڤ

لـەو سـاتـەوەی کـە زەوی دەسـتـی بـە سـوورانەوە کـردووە هـیچ کەس بـەڕادەی ئـەو خۆشسـت نـەبووە. هـیچ کـەس بـە ڕادەی ئـەو تاسەی نەکراوە.

بە درێژایی سەدەکان حەسرەتی هیچ کەسێك وەك ئەو ناخەکانی نەهەژاندووە. هیچ کەس بە ڕادەی ئەو خەونەکانی نەڕازاندوەتـەوە. شـوێنکەوتەی هـیچ کـەس بـە ڕادەی ئـەو زیـادی نـەکردووە. ئـەو هەمیشە لە لایلایەی دایکاندایە. مرۆڤەکان بەردەوام بەناوی ئەوەوە لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە، بەوەوە ژیانیان خۆشـدەوێت، بـەوەوە مەرگ جوانە. تەنانەت مرۆڤەکان بە تاسەی بینینی ئەوەوە شەیدای مەرگ دەبن.

ئـەو ئارامییـە، ئاسـوودەیییە، وەفایـە. ئـەو خۆشەویسـتییە. خۆشەویستی بەوەوە ژیایەوە، بەوەوە گەشـەی کـردو گـەورە بـوو. ئێستاش بەهۆی ئەو تۆوانەی ئەو جێی هێشتوون، سەر ڕووی زەوی دەژێتەوە. ئەو خۆرە خاکە دایکە باوکە ئەو دۆست و یارە، گەر ئەو هـەبێت خۆشـی و شـادمانی هەیـە. بـە بـوونی ئـەو ڕووەکـان دەگەشـێنەوە، دڵـەکان ئاسـوودە دەبـن. بـە بـوونی ئـەو لـە ژیـانی دونیاو ژیانی دواڕۆژیشدا بەختەوەری دەسـت دەکـەوێت. بـە بـوونی

ئـەو منـداڵان، دایکـان، باوکـان و، بەتەمەنـەکانیش ئـارام دەگـرن و ئاسوودە دەژین. ئەو خۆشەویستترینە.

لەو ڕۆژەوەی دونیا بەدیهێنراوە، بە نرخترین وتەی مرۆڤ وتەکانی ئەوە. بریقەدارترین و شیرینترین و ئـارامی بەخشـترین وتـە لـە زاری پیرۆزی ئەوەوە هەڵوەریون و دڵە ڕەش بوەکانی مرۆڤەکانی ڕووناك کردووەتەوە.

دونیـای کـردە باخچـەیەکی ڕازاوەی گـوڵ و گـوڵزار. تەنانـەت مرۆڤـەکان وتـەکانی ئـەویان بـە دەقێکـی پـیرۆز زانیـوەو، تونـد باوەشـیان بـەم ئومێـدە ڕزگارکـەرەدا کـردووەو، وەك هێمایـەکی شەرەف تا مردن لـە سینەیاندا پاراستویانن. بـەهیوای ئـەوەی لـە دوای مردن ببێتە هۆکاری شەفاعەت بۆیـان لـە کفنەکانیانـدا لەگـەڵ خۆیان هەڵگرتووە. چونکە ئەو خۆشەویستی زاتی (الله) یە.

ئـەو چـاوەی ئـەوی نـەبینیبێت خـۆی بـە نابینـاو، ئـەو گوێیـەی دەنگـی ئـەوی نەبیسـتبێت خـۆی بـە کـەڕ و، ئـەو ژیرییـەی لێـی تێنەگەیشتبێت خۆی بە نوقسان زانیوە.

ئـــەو ســـەردەمەی ئـــەوی تێـــدا ژیـــاوە بووەتـــە "ســـەردەمی خۆشبەختی"، تا ڕۆژی دوایی وەك مۆدێلێکی خـوازراوی مرۆڤایـەتی کە هەمیشە هەوڵیانداوە پێـی بگـەن دەمێنێتـەوە. ڕێبازەکـەی وەك شـێوازێکی ژیـان کـە تـا ڕۆژی دوایـی کـۆن نابێـت و لاواز نابێـت بەردەوام دەبێت. چونکە ئەو پێغەمبەری خوایە.

لەیەکەم ڕۆژی لەدایك بوونیەوە بووەتە سەروەری هەموو شوێن و ساتێك. بۆ هەر شوێنێك چووبێت شەرەفمەندی کردووە. هەر شوێنێك کە قاچە موبارەکەکانی ئەو پێی پێدا نابێت شەرەفمەند بووە. ئەو پێغەمبەری هەموو کات و زەمانێکەو نێردراوی ئاخر زەمانە. ئەو هەواڵدەری قیامەت و بەهەشت و جەهەننەمە.

ئەو؛ ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەیە کە لەو ڕۆژەدا کە نارەحەترین و تەنگترین ڕۆژی هەموو مرۆڤێکە، چاوەکان بە ئومێدی ئەوەی کە ببێتە ڕزگارکەریان بەلای خۆیدا وەردەگێڕێت.

ئەو لە پەرستگاکاندا هەیە، لە ئاسمانەکاندا هەیە، لەلای (ڕەحمان)یش هەر ئەو هەیە. هەروەها تاجی سەری دڵەکان هەر ئەوە. لە مەککەو مەدینە. لە قودس، لە ئیستانبوڵ، لەسەرای بۆسنەش هەر ئەو بوونی هەیە. کەعبە زەردەخە بۆ ئەو دەکات. هەنگاو هەنگاو لەگەڵ هەر هەنگاوێکی تەوافەکاندا خۆشەویستی ئەو هەستی پێ دەکرێت. دەنگدانەوەی دروودەکانی شەپۆل شەپۆل لە مزگەوتی (پێغەمبەرەوە) بە دونیادا بڵاودەبێتەوە. دەرگای قودس لەدووی ئەو دەگەڕێت بۆ گەیشتن بە ئاسمان. لە منارەی مزگەوتەکانەوە ناوی پیرۆزی ئەو دەخوێنرێتەوە. ئەو لەدڵی هەموو مرۆڤەکان و هەموو شارەکاندا محمدی (رسول الله)یە.

ئەو فێری ئەوەی کردین کە ببینە مرۆڤ، ئەو خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و سەرکەوتنی فێرکردین. فێری کردین دەست بەسەری

هەتیودا بێنین و ڕاست ڕووبەڕووی دوژمن ڕاوەستین. ئەو مناڵانی نەبەردی و، زەلیلیی و ئەسارەت و، شەرەفمەندی و ئازادی فێرکردین.

ئەو فێری کردین دەکرێ بەبێ ڕووشاندنی ناموس و، خێزان و، پشتگیری کۆمەڵگا، وەك مرۆڤ بێ شەڕوشۆڕ، بێ یەکتر شکاندنەوە لەسەر پێکانمان ڕاوەستین و بمێنینەوە.

ئەو هەموو بەئاگا هاتنێکی لەخەو بە دوعاوەو، هەموو هەنگاوێکی بەزیکرەوە بوو. هەموو گفتوگۆکردنێکی دانایی و ژیری لێ دەچۆڕا. پێکەنینی لەناخەوە بوو. تووڕەبوونی لەسەر حەق بوو، نەك لەبەر خۆی. لەبەر بەرژەوەندی ئوممەتەکەی ئامادەبوو پارچە پارچە بێت، لەبەر ئێمە بەرگەی هەموو جۆرە ئازار و ناڕەحەتیەکی دەگرت و تەنانەت ئۆفێکیشی نەدەکرد.

چونکە ئەو شەرەفمەندترینی بەدیهێنراوەکان و پێشەوای هەڵبژێردراوان و خۆری مەدینە بوو.

لە خەیاڵی خۆماندا دەمانوت خۆزگە هیچ نەبێ بۆ یەك ڕۆژ، تەنها یەك ڕۆژ لەگەڵ سەروەری مرۆڤایەتی کە لە دڵیدا بچووکترین جێگا بۆ بێئاگایی نادۆزرێتەوە، بژیاینایەو بەدیداری شەرەفمەند ببووینایە.

بۆ ئەوەی بزانین کە لە بیست و چوار کاتژمێری ڕۆژێکدا ئەو کارانەی ئەنجامی دەدان چی بوون، ئەو ئامۆژگاریانەی دەیکردن

چـی بـوون، بـه سـوود وەرگـرتن و پشـت بەسـتن بـه سەرچـاوه صەحیحەکان هەندێ بابـەتمان سـەبارەت بـه ژیـان و هەڵسـوکەوتی ڕۆژانەی پێغەمبەری خواﷺ هەڵبـژاردوەو لەسـەر شـێوازی پرسـیارو وەڵام ئامادەمان کردوون.

سەروەرمان به درێژایی تەمەنی ژیانێکی سادەو ساکاری بۆ خۆی هەڵبـژاردووه. سـەرەڕای ئـەو هـەموو ئیمکانیاتـەی کـه پێشکەشـی دەکرا، ئەو هەر ئەو دونیـای پـێش دەخسـت و هەمیشـه دەیویسـت بیرۆکەی "با دونیا بۆ ئەوان و بەهەشت بۆ ئێمه بێت" بچەسپێنێت.

ئەو هەمیشه سادەیی و، لـەناخی دڵـەوه هاوبەشـی کـردن و، دڵ خۆش بوون بەو شتانەی کـه هاوبەشـی پێـوەکردوون هەڵبـژاردووه. ئەو کەسانەی که چاویان له هەڵسـوکەوتی ئـەو کـردووه ئامۆژگـاری کردوون که هەردەم ئەم خوو ڕەوشته جوانانه لەخۆیاندا بەرجەسته بکەن. جارێك ئەم گفتوگۆیه لەنێوان پێغەمبەروﷺ هاوەڵەکانیدا کرا؛ ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوه:

– کاتێك پێغەمبەری خودا له جێگاکەیـدا ڕاکشـابوو چـوومه لای. ل حەسـیرێکی ڕاخسـتبوو کـه لـه لقـی دارخورمـا دروسـت کرابـوو. سـەرینێکیش لـەژێر سـەریدا بـوو کـه بەرگەکـەی لـه پێسـتەو ناواخنەکـەی لـه پـەلکی خورمـا بـوو. هەنـدێك لـەهاوەڵان لەگـەڵم هاتبوون. حەزرەتی عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێت) هات.

لەوکاتەدا پێغەمبەری نازدارمان کەوتە سەرلا. حەزرەتی عومەر کە بینی هیچ داپۆشەرێك لەنێوان پێستی موبارەکی و حەسیرەکەدا نییەو تاڵە دارخورماکان لەسەر پێستی موبارەکی نیشانەیان جێهێشتوە، گریا.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: "بۆچی دەگریت؟"

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی:

-"سوێند بەخوا هۆکاری گریانەکەم تۆیت. بۆ ئەوە دەگریم کە دەزانم تۆ لای خوای گەورە چەند بەنرختری لە کیسراو قەیسەر، بەڵام کیسراو قەیسەر چۆن دەژین لەم دونیایەداو تۆش کە پێغەمبەری خودای لەم شوێنەدایت کە دەیبینیت".

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا ڕازی نابیت دونیا بۆ ئەوان و، پاشەڕۆژیش بۆ ئێمە بێت؟".

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: "بەڵێ، ڕازی دەبم".

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: " دڵنیابە کە هەر وایە ".

لەنێو خێزانەکانی پێغەمبەردا، (عائیشە)ی دایکی موسوڵمانان (خوای گەورە لێی ڕازی بێت) ئەم بەشەی ژیانی پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە کە وەك پوختەیەکە لە ژیانە نموونەییەکەی و دەفەرمویّ:

-"پێغەمبەری خودا هەر کە شەوی لێ دەهات حەسیرێکی دەبردە ژوورەکەی خۆی و نوێژی لەسەر دەکرد. کاتێك ڕۆژیش

دەبووەوە زنجیرەیان لەسەر دەبەست و لەگەڵ خەڵکەکەدا لەسەری دادەنیشتن".

ئەم ڕووداوەیش لەنێوان پێغەمبەری خواﷺ عائیشەی دایکماندا ڕوویداوە. هەر لە حەزرەتی عائیشەوە پێمان گەیشتووە کە دەڵێت:

-"جارێك خانمێك لە ئەنصارەکان هاتە لام. نوێنەکەی پێغەمبەری خوای بینی کە لە دوو پارچە جەواڵ دروست کرابوو، پاشان ڕۆیشت. پاش ماوەیەك نوێنێکی بۆ ناردم کە ناواخنەکەی بەخوری پڕکرابوو. کاتێك پێغەمبەری خواﷺ هاتە لام، پێی فەرمووم:" ئەمە چییە؟"، منیش وتم: "فلانە خانم لە ئەنصار هاتبووە لام. کاتێك نوێنەکەتی بینی ئەمەی بۆ ناردوویت".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەمە بگەڕێنەرەوە!".

بەڵام من نەمگەڕاندەوە. حەزم کرد لەماڵەکەمدا بێت. پێغەمبەری خواﷺ سێ جار داوای لێ کردم کە بیگەڕێنمەوە.

دوایین جار پێی فەرمووم:

-"عائیشە! ئەم نوێنە بگەڕێنەرەوە. سوێند بەخوا، ئەگەر بمویستایە خوای گەورە کێوی لە ئاڵتون و زیو دەخستە بەردەمم".

سەروەرمان هەموو بەیانییەك زوو لەخەو بەئاگا دەهات، جوانترین جلوبەرگی خۆی دەپۆشی و دەست بەجێ خۆی بۆ نوێژی بەیانی ئامادە دەکرد. پێش نوێژیی بۆ ئەو هاوەڵانە دەکرد کە لەگەڵ بیستنی بانگی بیلالدا بەرەو مزگەوت دەکەوتنەڕێ.

پاشانیش گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن بۆ خێرو چاکەو وشیاری دەکردنەوە. پاشان بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان لەڕێگەیەکی حەڵاڵەوە بۆ ناو شار بڵاودەبوونەوە.

هەموو دەزانین کە مرۆڤێکی وەك پێغەمبەری سەروەرمان کە ئەو هەموو شوێنکەوتوانەی هەبوو، شیاو نییە هەموو ڕۆژێکی ژیانی بەهەمان شێوە تێپەڕێت. هەموو ڕۆژێکی ژیانی ئەو قورس و پڕ لە ڕووداوی سەرسوڕهێنەر بووە.

لەم کتێبەدا ئێمە بیرمان لەوە کردەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزماندا ﷺ بۆ گەشتێك بەڕێ بکەوین و وتەکانی لەسەرچاوەی صەحیح و دروست کۆبکەینەوە.

فەرموون بۆ دیمانەیەکی یەك کاتژمێری لەگەڵ سەروەری مرۆڤایەتیدا.

## سیمای سەروەرمان

ئێستاش کورتەیەك لەسەر سیماو شێوەی ئەو زاتە پـیرۆزە بـاس دەکەین، کە بـوونی هـەموو بوونـەوەری شـەرەفمەند کـردووە، ئـەو زاتەی گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە شەرەفمەند بێـت بـەوەی ببێتـە خۆشەویستی زاتی الله، خوای هـەموو بوونـەوەر. ئـەویش بـە سـوود وەرگرتن لە وتەو گێڕانەوەی ئەو هاوەڵانـەی کـە بـە درێـژایی ژیـانی وەك پەروانـە لـەدەوری بـوون و لـە گیـانی خۆیـان زیـاتر خۆشـیان دەویست.

حەزرەتی عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێـت) بـەم شـێوەیە ڕووخسـارو شێوەی حەزرەتی موحەممەدمانﷺ بۆ وەسف دەکات:

"پێغەمبـەرﷺ بـاڵای نـەزۆر بـەرزبوو نـە کـورتیش بـوو. بـاڵای مامناوەند بوو بەلای بەرزدا دەیڕوانی. پەنجـەکانی دەسـت و قاچـی ئەسـتوور بـوون. سـەری گـەورە بـوو، کـە بەشـێوەیەکی هاوسـەنگ لەگەڵ لاشەیدا گونجاو بوو. ئێسکی شانەکانی و ئەژنۆی و مەچـەکی پتەوبوون. لە سنگییەوە تا ناوکی لەشـێوەی هێـڵ مـووی ورد درێـژ دەبووەوە. جگە لەمە لە سنگی و سکیدا هیچ مووی تر نەبوو.

کاتێك پێغەمبەرﷺ بە ڕێدا دەڕۆیشت قاچەکانی کێش نەدەکرد، بەڵکو هەنگاوەکانی فراوان و بەهێز بوو. وەك بڵێی لە شوێنێکی بەرزەوە قاچی دابنێت. ڕاست بۆ بەردەمی هەنگاوی دەنا.

قژی پیرۆزی نەزۆر لوول بوو نەزۆر نەرم و خاو بوو. ڕیشیشی پڕبوو. دەموچاوی لاواز نەبوو. خڕی تەواویش نەبوو. وەك زیو پاك و درەوشاوە بوو.

ڕووخساری سەروەرمان سوررو سپی بوو. ئارەقی دەموچاوی وەك مرواری بوو. بۆنی لە میسك خۆشتر بوو.

چاوەکانی گەورەبوون. ڕەشێنەی چاوەکانی ڕەشێکی قەترانی بوو. لەسپێنەی چاوەکانیدا کەمێك سووری هەبوو. لەشی نە لاواز بوو نە قەڵەویش بوو.

کاتێك بیویستایە سەیری لایەك بکات، بە هەموو لاشەی ئاوڕی دەدایەوەو سەیری دەکرد. ناوشان پان بوو. لەنێوان هەردوو دەفەی شانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی هەبوو.

ئەو کەسانەی کە بۆ یەکەم جار پێغەمبەری ئازیزیان دەبینی لەبەر شان و شەوکەت و ویقارە مەعنەوییەکەی تەزوو بەلەشیاندا دەهات. ئەوانەیش کە لەنزیکەوە دەیانناسی لەناخی دڵیانەوە ڕێزیان لێ دەگرت و خۆشیان دەویست. هەرکەسێك بیویستایە باس لە خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانی ئەو بکات، نەیدەتوانی نەڵێت:"من

نـه پـێش ئـەو و نـە دوای ئـەو کەسـم لەشـێوەی ئـەو نـەبینیوە" (قسەکەی حەزرەتی عەلی لێرەدا تەواو دەبێت).

لە هندی کوڕی ئـەبو هالـەو کـوڕی حـەزرەتی خەدیجـە (ڕەزای خوای لێبێت) و هاوەڵـە بـەڕێزەکانی دیکـەوە بیسـتومانە:"هەرچـی جوانیـە لـە پێغەمبـەری خـوادا کۆبووبـووەوە. ڕووی پـیرۆزی وەك مانگی چواردە دەدرەوشایەوە".

پێغەمبەرﷺ باڵای مامناوەنـد بـوو کـە بـەلای بـەرزدا دەیڕوانـی، قـژی نـە لـوول بـوو نـە زۆر خـاویش بـوو. لەسـەرەتادا لەسـەر دەستووری (ئەهلی کیتاب) قژی پێشەسـەری خـۆی شـۆڕدەکردەوە بەبێ لەت کردن، بەڵام لەدواییدا قژی خۆی دەکرد بـە دوو لەتـەوەو لای دەدا بەم لاو بەولای سەریدا. جـاری وادەبـوو قژەسـەری دەیـدا لەنەرمەی هەردوو گوێی.

ڕەنگی پێستی سوورو سپییەکی جـوان بـوو. نێوچـاوانی کـراوەو فراوان بوو. برۆکانی درێژو کەوانەیی بوون و لەیەکەوە نزیـك بـوون، بەڵام گرژ نەبوون. کۆتایی برۆکانی باریك بوون.

لەنێوان هەردوو برۆیدا دەمارێك هـەبوو کـە لـەکاتی تووڕەبوونـدا بەرجەستە دەبوو و دەبینرا. دەموچاوی لەشوێنی برۆکانییەوە بەرز بـوو، لای سـەری لوتیـەوە باریـك دەبوویـەوە. ڕێکـی و گونجـاوی دەموچـاوی پـیرۆزی لـە چـاوی ئەوانـەی سـەرنجیان ورد بـوو

ئاشکرابوو. درەوشـاوەییەکی جیـاواز لەسـەر لـووتی هـەبوو. ڕیشـی پڕبوو.

گۆناکـانی پێغەمبـەری نـازدارﷺ ڕێـك بـوو، خـڕ نـەبوو. دەمـی گەورەیەکی سروشـتی بـوو. ددانـەکانی وەك دەنکـە مـرواری بـوون. هەموو ئەندامـەکانی لەشـی هاوسـەنگ و ڕێك بـوو. سـنگی و نێـوان هەردوو دەفەی شانی فراوان بوو. زۆربەی لەشی گۆشتن بوو. سنگی و سکی لەیەك ئاستدا بـوو، دەرنەپـەڕیبوو. ئێسـکی زۆر پتـەو بـوو. کاتێك جلی دادەکەند لە جەستەیەوە نوور پەرش دەبووەوە. لەشـی توکن نەبوو.

تەنها لەسەر شانەکانی کەمێك مـوو هـەبووە، ئێسـکیی مەچـەکی درێژو لەپی دەستی پان بوو. پەنجەکانی دەست و قاچی ئەستوورو درێـژ بـوون. بنکـی پێیـەکانی کـەمێك چـاڵ بـوو. پێیـەکانی کـەمێك گۆشتن بوو. کاتێك ئاو بەسەر پێیەکانیدا بڕژایە بەچواردەوری پێیدا دەهاتـە خـوارەوە. کاتێـك بەڕێـدا دەڕۆیشـت بـەهێز قاچـەکانی هەڵـدەگرت و لەڕۆیشـتندا لەرینـەوەی شـل و شـۆل نـەبوو. هەنگاوەکانی فراوان بوون و بەسەلاری و ئـارامی بەڕێدا دەڕۆیشت. سـەیرکردنی بـۆ زەوی زیـاتر بـوو لەسـەیرکردنی بـۆ ئاسمـان، سەیرکردنی زەویشی تەنها بەلا چاوبوو، سەری شۆڕ نەدەکردەوە.

کاتێـك دەڕۆیشـت لـەدوای هاوەڵەکانیـەوە دەڕۆیشـت و ئەگـەر لەڕێدا کەسێکیانی ببینیایە دەستپێشخەری دەکرد لەسەلام کردندا.

پێغەمبەری خوداﷺ دەموچاوی زۆر جوان بوو، دەنگیشی زۆر خۆش بوو. لە دەموچاویدا هەر دەتگوت خۆر هەڵهاتووە.

پێغەمبەری ئازیزﷺ لەنێو سەدان کەسدا جوانترین و درەوشاوەترینیان بوو. ئارەقی لەخۆشترین بۆنەکان خۆشتر بوو. ساردی دەستی لەبەفر ساردتر بوو. بۆنی لە میسك خۆشترو دڵڕفێنتر بوو.

ئوم مەعبەد دەڵێت:

سپێنەی چاوی پێغەمبەرﷺ سپییەکی بێگەرد بوو، ڕەشێنەی چاویشی قەترانی بوو دەتوت لە خواییەوە بە کل ڕێژراوە.

کاتێك بێدەنگ دەبوو سەلارو سەنگینیەکی زۆری تێدا دەبینرا، کاتێکیش قسەی دەکرد دەم بەخەندە دەبینرا. وتەکانی هەر دەتگوت لەشێوەی مرواری دانەدانە ڕیزکراون و شیرین شیرین لە لێوە پیرۆزەکانییەوە دەهاتنە دەرەوە.

وتەکانی ڕوون و ئاشکرا بوون و ڕاست و دروستو ناڕاستی لەیەك جیادەکردەوە. نەهێندە کەم قسەی دەکرد کە لاوازی پێوە دیاربێت، نە ئەوەندە زۆریش قسەی دەکرد کە بە وتەی زیادەو بێ نرخ بژمێردرێت.

کاتێك لە دوورەوە دەبینرا، بەشان و شەوکەترین و شکۆمەندترین مرۆڤ بوو، کاتێکیش نزیك دەبووەوە

سەرنجڕاكێشترین و شیرینترین مرۆڤ بوو. ڕوو گرژو مۆن نەبوو. هەمیشە لێو بەخەندە بوو.

پێغەمبەرﷺ زۆر حەزی بە بۆنی خۆش دەكرد. بۆنێكی تایبەتی خۆشی لێوە دەهات كە پێی دەوترا (سوكتە).

هاوەڵانی ئازیز گوتویانە: پێغەمبەری خوداﷺ لە هەر كۆڵانێكەوە تێپەڕبوایە، ئەو شوێنەی بە بۆنی خۆشی خۆی پڕ دەكردەوە.

زۆربەی كات دەیفەرموو: "بۆنی خۆشی پیاوان دەبێت بەجۆرێك بێت كە بۆنە خۆشەكەیان بڵاوببێتەوەو هێشتاش خۆیان دەرنەكەوتبن ( واتە پێش خۆیان بۆنە خۆشەكەیان گەیشتبێت)، ئافرەتانیش پێویستە بەبێ بۆن خۆیان دەركەون، (واتە: جەوهەریان هەبێت و كارامەو لێ هاتوو بن، بەوە خۆیان بڕازێننەوە نەك بە بۆن)".

كاتێك قسەی بكردایە، دانە دانە قسەی دەكرد. ئەگەر بیویستایە جەخت لەسەر شتێك بكاتەوە، سێ جار دووبارەی دەكردەوە.

ڕۆژێك لە حەزرەتی حەسەنیان پرسی (ڕەزای خوای لێبێت): "پێغەمبەرﷺ بە چ شێوازێك گفتوگۆی دەكرد؟"، ئەویش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: "هەمیشە بیری دەكردەوە، زۆربەی كات بێدەنگ بوو، لە شوێنی نابەجێدا قسەی نەدەكرد. هەموو ڕستەیەكی بەڕوون و ئاشكرایی و تەواوی دەگوت. كاتێك بەدەستی ئاماژەی بكردایە، هەموو دەستی بەرزدەكردەوەو كاتێك سەری لە شتێك سوڕبمایە

ناولەپی دەستی هەڵدەگێڕایەوە. هەندێ جار لەکاتی قسەکردندا دەستەکانی لەسەر یەکتر دادەنا. کە ئەدوا بێزاری دڵخۆش دەکرد. کاتێك خۆشحاڵ بوایە چاوەکانی ڕووی لە زەوی دەکرد. زۆر کەم پێدەکەنی، کاتێکیش پێدەکەنی زەردەخەنەی دەکرد، ئیتر ئەمە پێکەنینی ئەو بوو".

پێغەمبەری خۆشەویستﷺ گرنگییەکی تایبەتی بە پاك‌و خاوێنی دەدا. ئەگەر کەسێکی ببینیایە جلوبەرگی پیس و چڵکنی پۆشیوە دەیفەرموو: "ئایا ئەم پیاوە توانای نییە جلوبەرگەکانی بشوات؟".

ڕۆژێك پیاوێکی بینی کە جلێکی پەڕپووتی لەبەردابوو، هاتبووە خزمەتی. ئەویش پێی فەرموو: "هیچ توانایەکی داراییت نییە؟"

پیاوەکە وتی: "بەڵێ، هەمە". پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "لەکاتێکدا خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی خۆی پێداویت، دەبێت ئەو نیعمەتەی بەسەرتەوە دیاربێت".

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: "هەرکەسێك هێندەی زەڕڕەیەك باوەڕی هەبێت، ئەوا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری دەبێت".[1]

## پەیوەندی سەروەرمان
## لەگەڵ مرۆڤەکاندا چۆن بوو؟

با بزانین حەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) پەیوەندی پێغەمبەرمان لەگەڵ مرۆڤەکاندا چۆن بۆ باس دەکات:

لە هندی کوڕی ئەبو هالەی خاڵم پرسی:"پێغەمبەری خوا کاتێک لەماڵ دەچووە دەرەوە چی دەکرد؟"

ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی: "پێغەمبەری خوداﷺ بە تەنها لەو بابەتانەدا قسەی دەکرد کە پەیوەندی بەخۆیەوە هەبوو، یاخود نێوان موسوڵمانانی گەرم دەکردو ساردو سڕی نێوانیانی نەدەهێشت".

لە هەر خێڵ و تیرەیەك، ڕێزی تایبەتی لەو کەسە دەگرت کە خاوەن خەسڵەتی بەرزبوو، بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو تیرەیەی بەو کەسە دەسپارد.

ئاگای لە بارودۆخی خەڵك بوو خەڵكیش ئاگایان لەو بوو. هیچ کەسی لە ڕووە گەشاوەو خووڕەوشتە بەرزو جوانەکانی خۆی بێبەش نەدەکرد. سەری لە هاوەڵانی دەداو کاتێك لەناویاندا بوو لێی دەپرسینەوە. ستایشی کاری چاکەی دەکردو هەوڵی

پەرەپێـدانی دەدا، سەرزەنشـتی کـاری خراپــەی دەکـردو هــەوڵی نەهێشتنی دەدا.

کارەکانی میـانڕەو بـوون. کەسـێکی بـێ نـاکۆکی بـوو. لەخـەمی ئەوەدا بوو موسوڵمانان هەرگیز نەکەونە نێو بێئاگایی و غەفڵەتەوە، بــەردەوام ئاگـاداری دەکردنــەوەو فەرامۆشــی نــەدەکردن. هــەموو ڕەفتارێکی ئاسایی بوو.

کەسە نزیکەکانی لە مرۆڤە هەرە باشەکان بوون. لەلای ئـەو پلـە بەرزترین و باشترین و نـزیکترین هـاوەڵ ئـەوەبوو کـە خێـرو چـاکەو یارمەتییەکانی جوانترین و باشترین بوو.

ئـەو بـەبێ یـادی خـوای گـەورەو میهرەبـان نـە هەڵدەسـتاو نـە دادەنیشت. لەهەر شوێنێك بوایە، کاتێ لەگەڵ کۆمـەڵێك دابنیشـتایە تا کۆتایی کۆبوونەوەکە دادەنیشت و فەرمانی بە موسـوڵمانان دەدا کە چاو لەو بکەن.

هەرکەسێك بچوایەتە لای بەجۆرێك ڕێزی دەگرت ئـەو کەسـە وای دەزانی کە هیچ کەس لای پێغەمبەری خواﷺ لـەو ئـازیزترو بـەڕێزتر نیــــە. هەرکەســـێك لای دابنیشـــتایە (یــــاخود بهاتایەتــــە لایو پێویستییەکی خۆی بخستایەتە ڕوو تـا ئـەو کەسـە دەڕۆیشـت، لای دادەنیشت).

هەرکەسـێك داوای پێداویسـتییەکی لێ بکردایـە، نەیدەگێڕایـەوەو پێــی دەدا. یــاخود بــەزمانێکی شــیرین و نــەرم دەیگێڕایــەوە.

خوورەوشتی جوانی هێندە فراوان بوو، کە لەناخی هەموو مرۆڤەکاندا جێی خۆی کردبویەوە. ئەو وەك باوکێك بوو بۆ ئەوان. لەبابەتی هەق و مافدا هەموو کەس لای ئەو یەکسان بوون. کۆڕو دانیشتنی ئەو کۆڕو دانیشتنی نەرم و نیانی و حەیاو خۆڕاگری و ئەمانەت بوو.

لە دانیشتنی ئەودا نەهیچ دەنگێك بەرز دەکرایەوە، نە کەس تاوانبار دەکرا، نە کەمتەرخەمی و هەڵەی کەسێك بە ئاشکرا باس دەکرا. ئەوانەی لە دانیشتنی ئەودا بوون هاودەنگی یەکتر بوون و جیاوازیو پلەبەرزییان لەچاو یەکتردا تەنها لەڕووی ترسی خواو تەقواوە بوو. ئەوان کەسیان بە فیز نەبوون. لە کۆڕی ئەودا ڕێز لە گەورە دەگیراو بچووکیش سۆزی پێ دەدرا. ئەوەی خاوەن پێداویستی بووایە پێشنیاری دەکرد بە هاوەڵان و هەوڵی دەستگیرۆیی دەکرد. غەریبی دەپاراست."

لێم پرسی: "شێوازی هەڵسوکەوتی بەرامبەر ئەو کەسانەی کە لەکۆڕیدا بوون چۆن بوو؟".

وەڵامی دامەوە:"هەمیشە دەم بەخەندە بوو. نەرم و نیان بوو. دڵ ڕەق نەبوو. نە هیچ کەسێکی سەرزەنشت دەکردو نە کەسیشی بەرزدەکردەوەو ستایشی دەکرد. ئەگەر شتێکی بەدڵ نەبوایە چاوی لێ دادەخست. هیچ کەسی بێ ئومێد نەدەکرد".

هەمیشە خۆی لە سێ شت گرتبووەوە، دەمەقاڵێ لەگەڵ خەڵکدا، زۆر قسە کردن، خۆ خەریك کردن بە شتی بێ سوودو بەتاڵەوە. (خەڵکیی وەك خۆی لەو سێ شتە دوور دەخستەوە، کەسی بەخراپ لەقەڵەم نەدەداو لەکەداری نەدەکرد).

بەشوێن عەیب و کەموکوڕی خەڵکدا نەدەگەڕا. تەنها بە باسکردنی پاداشت ئومێدەواری دەکردن.

کاتێك ئەو قسەی دەکرد، ئەوانەی کە لە کۆڕەکەدا بوون وەك بڵێی باڵندە لەسەر سەریان نیشتبێت بێدەنگ و بێ جووڵە دەمانەوەو کاتێك کە ئەو قسەکانی تەواو دەکرد ئینجا ئەوان قسەیان دەکردو لەخزمەتیدا دەمەقاڵێیان نەدەکرد.

کاتێك کەسێك لای ئەو قسەی بکردایە، ئەوانی دیکە تا ئەوکەسە لە قسەکانی تەواو دەبوو بێدەنگ دەبوون. (لای ئەو یەکەم وتە کە دەوترا جیاوازی نەبوو لەگەڵ کۆتا وتە). ئەوشتەی هاوەڵەکانی پێی پێبکەنینایە، ئەویش لەگەڵیان پێی پێدەکەنی‌و، ئەگەر سەریان لەشتێك سوڕبمایە ئەویش وەك ئەوان سەرسامی نیشان دەدا.

ئەگەر غەریبەیەك بهاتایەتە ناو کۆڕەکەی و قسەیەك یاخود پرسیارێکی نابەجێ و دڵ شکێنی بکردایە، دانی بەخۆیدا دەگرت، تاوەکو هاوەڵەکانیشی وەك ئەو هەڵسوکەوت بکەن.

(دروودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: "هەرکەسێکتان خاوەن پێداویستییەکتان بینی، یارمەتی بدەن و کۆمەکی بکەن".

هەرگیز قسەی بە کەس نەدەبڕی. ئەگەر کەسێکیش لە هەق و ڕاستی لای بدایە، ڕێی لێ دەگرت یاخود لەو شوێنە هەڵدەستاو بەجێی دەهێشت.

حەزرەتی حسێن (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لەباوکم پرسی، کاتێك پێغەمبەرﷺ دەگەڕایەوە بۆماڵەوە سەرقاڵی چی بوو؟ ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە:

-"ئەو کاتێك دەگەڕایەوە ماڵەوە کاتەکانی خۆی بەسەر سێ شتدا دابەش دەکرد، بەشێکی بۆ خوای گەورە، بەشێکی بۆ خێزانەکەی، بەشێکیشی بۆ خۆی. ئەوکاتەی کە بۆ خودی خۆی تەرخانی کردبوو لەگەڵ خەڵکانی تردا هاوبەشی پێوە دەکرد".

ئەوکاتەی کە بۆ ئوممەتەکەی تەرخان کردبوو ئەو کەسانەی بۆ لای خۆی بانگهێشت دەکرد کە خاوەن مەردایەتی و خووڕەوشتی جوان و پلەی بەرز بوون لەڕووی ئیمانەوە. هەندێکیان پێویستییەك، هەندێکیان دوو پێویستی و، هەندێکیشیان لەوە زیاتر پێویستییان هەبوو. پێغەمبەری خوداﷺ لەگەڵ ئەواندا سەرقاڵ دەبوو، وەڵامی پرسیارەکانیانی دەدایەوەو دەیفەرموو:

-"ئەو کەسانەی کە لێرەن با ئەمە بەو کەسانە ڕابگەیەنن کە لێرەنین، ئەگەر هەرکەسێکیش نەیتوانی خۆی بێتەلام و پێویستی خۆیم پێ بڵێت، ئێوە وەرنە لام و پێویستییەکەی ئەوم پێ بڵێن. ئەو کەسەی کە پێویستیی کەسێکی دیکە بگەیەنێت، کە خۆی

ناتوانێت پێم بڵێت، ئەوا خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا هـەنگاوەکانی چەسپاو دەکات".

ئەوکەسانەی کە دەچوونە لای وەك داواکـارو خـاوەن پێویسـتی دەچوونە لای، بەڵام کاتێك دەهاتنە دەرەوە لای، چێژی گەورەترین زانستیان چەشتبوو، وەك نیشاندەری خێرو چاکە دەهاتنە دەرەوە.

هـیچ نانێـك وەك ئـەوە بـاش نییـە کـە مـرۆڤ لـە ڕەنجەشانی خۆی بخوات، داود کە پێغەمبەری خوابـوو (سەلامی خوای لێبێـت) هـەر لـە دەسـتکەوتی ڕەنجـی شانی خۆی دەخوارد.

## وەڵامی پێغەمبەری ئازیزﷺ بۆ ئەو پیاوەی کە بەزانینەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ کردبوویەوە، چی بوو؟

ڕۆژێك کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا! من تیاچووم؟"

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "بۆچی؟".

پیاوەکە وتی: "لەمانگی ڕەمەزاندا چوومە لای خێزانەکەم".

پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: "کۆیلەیەك ئازاد بکە".

ئەویش وتی: "هەژارم، کۆیلەم لەکوێ دەست بکەوێت؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو مانگ بەڕۆژوو ببە"

کابراکە وتی: ئەوەشیانم پی ئەنجام نادرێت!"

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: "نانی شەست بێ دەرامەت بدە".

کابراکە وتی: "توانای ئەوەشیانم نیە".

لە کاتی ئەم گفتوگۆیەدا، پڕی بوخچەیەك خورما بۆ پێغەمبەری خوداﷺ هێنرا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەمە هەڵگرە، بیبە بەسەر هەژاراندا دابەشی بکە". کابرا وتی: "سوێند بەو خوایەی کە تۆی بە پێغەمبەری خۆی ناردووە، لە هەموو مەدینەدا لەمن هەژارتر نیە!".

پێغەمبەری خواﷺ بەبێ ویستی خۆی زەردەخەنەیەك گرتی و فەرمووی: "دەکەواتە، هەڵی بگرە، بیبەو خۆت بیخۆ".

## پێغەمبەری نازدارمان بەیانیان و ئێواران چۆن نزای دەکرد؟

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوداﷺ بـەیانیان و ئێـواران ئـەم نزایـەی فـەرامۆش نەدەکرد:

خوایە من داوای لێخۆش بوون و پارێزراویت لێ دەکەم لـە دونیـاو دواڕۆژدا. خوایە داوای لێبووردن و پارێزراویـت لێ دەکـەم لـە دیـن و دونیاو کەسوکارو مـاڵ و سـەروەتمدا. خوایـە عەیبـەکانم دابپۆشـە، ترس و بـیمم بڕەوێنـە، خوایـە بمپـارێزە لەبـەردەمم و لەپشـتمەوە، لەلای ڕاسـت و لای چـەپمەوەو لـەلا سـەرومەوە. پـەنا دەگـرم بـەتۆ لەوەی نهێنی کوژبکرێم لەلای خوارومەوە.[1]

## کاتێك پێغەمبەری خواﷺ ڕێـی نیشـانی خـەڵك دەدا ئەو خاڵانە چی بوون کە سەرنجی دەدان؟

پێغەمبـەری ئـازیزﷺ هـەنـدێك جـار کـە وتووێـژی لەگـەڵ خەڵکدا دەکرد، بۆ ئەوەی ئاسۆی بیرکردنەوەیان فـراوان بکـات و زانیـاری و تێگەیشتنیان پێوانە بکات، پرسیاری لێ دەکردن. عەبدوڵڵای کـوڕی

---

[1]- ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە.

عومـەر (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: "جارێکیـان پێغەمبەری خواﷺ ئەم پرسیارەی ئاڕاستەی ئەوانـە کـرد کـە گـوێ بیسـتی بـوون و فـەرمووی:"ئـەو درەختـە کامەیـە کـە گـەڵاکانی ناوەڕێت و لە موسوڵمانان دەچێت؟"

بیری دانیشتوان بەلای درەختەکانی نـاو دارستـاندا ڕۆیشـت. مـن دارخورما هات بە بیرمدا، بەڵام لەبەرئـەوەی منـداڵ بـووم، ئەوەنـدە بـوێر نـەبووم کـە وەڵام بدەمـەوە. لـە کۆتاییـدا کـەس وەڵامەکـەی نەزانی و وتیان: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ تۆ بیڵێ".

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "داری خورمایە!"

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر بـە درێـژایی تەمـەنی ئەمـەی لـەبیر نەدەکردو، دەیگوت:"خۆزگە بموێرایەو وەلامەکەم بگوتایە".

ڕۆژێکی دیکە کاتێك پێغەمبەری خـوداﷺ چـووە مزگـەوت، بینـی هاوەڵـە بـەڕێزەکانی بووبـوون بـە دوو کۆمەڵـەوە، کۆمـەڵێکیان بـە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزو زیکرو نزاوە خەریك بوون. کۆمەڵەکەی دیکەش بە باسکردنی بابەتی زانستییەوە خەریك بوون. پێغەمبـەری خوداﷺ فەرمووی:

-"هەردوو کۆمەڵەکە بە بابەت و باسی جوانەوە خـەریکن، بـەڵام خوای گەورە منی وەك فێرکارێك ناردووە".

ئەمەی فـەرموو پاشـان ڕۆیشـت و لای ئـەو کۆمەڵـە دانیشـت کـە باسی بابەتی زانستییان دەکرد.

لەم جۆرە کۆبوونەوانەدا حەزی بەو بابەتانە نەدەکرد کە زۆربەی خەڵکەکە لە وردەکارییەکانی تێنەدەگەیشتن.

ڕۆژێك لە کۆبوونەوەیەکی هاوەڵاندا باس لە بابەتی "قەدەر" دەکرا. کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ گوێی لەمە بوو لە ژوورەکەی خۆی هاتە دەرەوە، ڕوومەتی پیرۆزی وەك هەنار سوور بووبوو. ڕووی قسەکانی کردە هاوەڵان و فەرمووی: "ئێوە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەراورد دەکەن و دەیاندەن بەیەکدا. میللەتەکانی پێش ئێوەش هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو لەناوچوون".

ئامانجێکی دیکەی ئەم کۆبوونەوانەش ئەوەبوو کە هاوەڵە بەڕێزەکان، ئەو بابەتانەی کە لێی تێنەگەیشتبوون بۆ پێغەمبەرﷺ بخەنەڕوو، ئەو بابەتانەی کە بۆیان شی نەدەکرایەوە داوا لە پێغەمبەر بکەن بۆیان شی بکاتەوە.

ڕۆژێك لەنێو یەکێك لەو کۆبوونەوانەی پێغەمبەرﷺ دەیبەست، دوو پیاو دژبەیەك گفتوگۆیان دەکرد لەسەر بابەتێك. یەکێکیان گوتی:"تۆ دەربارەی ئەمە چی دەڵێیت، ئەگەر لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەماندا لەگەڵ دوژمن کەسێك بەخۆ پیاهەڵدانەوە ڕمێك دەربکات و بڵێت:"دەی وەڵامی ئەم هەڵمەتەم بدەرەوە، بزانم! من یەکێکم لە پاڵەوانەکانی تیرەی غەفار ؟".

بەرامبەرەکەی لە وەڵامدا وتی:"من پێم وایە هیچ پاداشتێك وەرناگرێت". کەسێکی سێهەمیش لەولاوە، دوای ئەوەی گوێبیستی

وتووێژەکەیان بوو وتی:"بە بۆچوونی من هیچ گرفتێك لەمەدا نییە!".

بیروبۆچوونی جیاواز هاتەکایەوەو هەرکەسەو شتێکی دەگوت. پێغەمبەری خوداﷺ دوای ئەوەی گوێی لە گفتوگۆکەیان گرت، فەرمووی:"بەدەستهێنانی پاداشت و ناوبانگ پەیداکردن دژی یەکترنین".

ئەو هەموو کات تێکەڵیی هاوەڵانی دەکرد. بەردەوام بە پەروەردەکردنی ئەوانەوە سەرقاڵ بوو، هانی دەدان بۆ ئەو شتانەی کە سوودو قازانجیان هەبوو و، ئاگاداری دەکردنەوە لەو شتانەی کە زیان بەخش بوون. وتەکانی چەندە کاریگەربوون، ئەوەندەش دڵخۆشکەربوون، هاوەڵانی بەردەوام دەیانویست قسەیان بۆ بکات.

ئەوساتەی پێغەمبەری خوداﷺ قسەی بۆ دەکردن. هاوەڵان لەو شوێنەی کە لێی دانیشتبوون کۆچیان دەکرد بۆ کەش و هەوایەکی ڕۆحی دوور لەخەم و پەژارەی دونیا.

جارێك ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) بە پێغەمبەرﷺ دەڵێت:

-"ئەی پێغەمبەری خوا. کاتێك ئێمە لە خزمەت تۆدا دادەنیشین دونیا زۆر بێ نرخ دەبێت لامان، تەنانەت بەلای مێشکیشماندا تێناپەڕێت، بەڵام کاتێك دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەو دەچینەوە ناو ماڵ و منداڵەکانمانەوە، بارودۆخەکە دەگۆڕێت".

پێغەمبەرﷺ وەڵامی دایەوەو فەرمووی: "ئەگەر لەهەمان بارودۆخدا بەردەوام بونایە، ئەوا فریشتەکان دەهاتنە سەردانتان".

ڕۆژێکی دیکە حەنزەڵە (ڕەزای خوای لێبێت) هاتە لای پێغەمبەری نازدارمانﷺ و پێی وت: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ، من بووم بە دووڕوو. کاتێك لە حزوری پیرۆزتدام و باسی بەهەشت و دۆزەخمان بۆ دەکەیت. هەموو ئەوانە دێنە پێش چاوم، بەڵام کاتێك تێکەڵ بە خاوو خێزانەکەم دەبم، هەموو ئەمانەم لەیاد دەچێتەوە".

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: "ئەگەر کاتێك لێرە دەچینە دەرەوە، هەر لەهەمان بارودۆخدابوونایە کە لێرە تێیدان، ئەوا فریشتەکان تەوقەیان لەگەڵ دەکردن".

## سەروەرمان لەسەر بابەتی ڕەچاوکردنی ماف و هەقدەست چی دەفەرمووٚ؟

لەژیانی کۆمەلآیەتیدا هانی ڕێزگرتن لە کارکردن و هەولّدانی دەداو هەمیشە بەم جۆرە ئامۆژگاریی ئەو هاوەلاّنەی دەکرد کە کرێکارو خزمەتکاریان هەبوو: "ئیشکەر، پێش ئەوەی عارەقی ناوچەوانی وشك ببێتەوە هەقدەستی کارەکەی بدەنێ و، کاتێك کە لەسەرەتای کارەکەدایە بڕی کرێکەی پێ بلّێن تاکو لەدواییدا لێك تێنەگەیشتن و دژایەتی لەنێوانیاندا نەیەتە کایەوە".[١]

هەر دەرفەتێکی بۆ بڕەخسایە، بەرپرسیارێتی مرۆڤەکانی بەرامبەر بەیەك دەخستەڕوو و دەیفەرموو: "نموونەی موسولّمان بۆ موسولّمان وەك بینا وایە کەهەندێکی هەندێکی دیکەی بەیەکەوە دەبەستێت. (واتە: هەمووی تێهەلّکێشە بەیەکەوە)".

لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، بەرپرسیارێتیمان بەرامبەر بەیەکتر بیر دەهێنێتەوەو ئەوە دەخاتەڕوو کە پێویستە لەسەرمان هەمیشە بەدیدی بەرپرسیارێتییەوە بەرامبەر بەیەکتر هەلّسوکەوت بکەین، بۆ گەیشتن بە کەشێکی هێمن و ئاشتیانە.

---

١-بەیهەقی ڕیوایەتی کردوە.

ئـەوەتا دەفـەرمووێت:"کەسـتان بەتـەواوی بـاوەڕ ناهێنێـت تـا هەرچی بۆ خۆی پێـی خۆشـە بـۆ بـرای موسـوڵمانیشـی پێـی خـۆش نەبێت".

-"موسوڵمان ئەو کەسەیە کـە موسـوڵمانان لـە دەسـت و زمـانی سەلامەت بن. موهاجیر ئەو کەسەیە کە لەوشـتانە دووردەکەوێتـەوە کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون".

هەمیشـە هـانی خـەڵکی دەدا بـۆ بەدەسـتهێنانی زانسـت و. زۆر هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی لە نەزانی دەربازیان بکات.

فەرموویـەتی:"هەرکەسـێك داوای زانسـت و زانیـاری بکـات، ئـەوا دەبێتە هۆی سڕینەوەی هەموو گوناهەکانی پێشووی".[1]

## سەرووەرمان ژیانی ڕۆژانەی چۆن بەسەر دەبرد؟

پێغەمبەری ئازیزﷺ کاتێك ڕۆژ دەبوویـەوە، دوای ئـەوەی نوێـژی بـەیانی دەکـرد هـەر لەسـەر ئـەو بەرماڵـەی نوێـژی لەسـەر دەکـرد، دادەنیشـت تـا ڕۆژ بەتـەواوی هەڵدەهات بـەم شـێوەیە دەمایـەوە.

---

١- پێشەوا ترمزی لە باسی زانستدا ڕیوایەتی کردوە.

هاوەڵە بەڕێزەکانیش لەدەوری پێغەمبەرﷺ دادەنیشتن و گوێیان لە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی دەگرت.

زۆربەی کات پێغەمبەرﷺ لەهاوەڵەکانی دەپرسی: "کەس هەیە خەونی بینیبێت؟" ئەگەر هەر کەسێك هەبوایە خەونی بینیبێت ئەوا دەیگێڕایەوەو پێغەمبەرﷺ بۆی لێك دەدایەوە. هەندێك جاریش ئەو خەونانەی دەگێڕایەوە کە خۆی بینیبووی، دوای ئەوە بەپێی پێداویستی خەڵك گفتوگۆی جیاواز دەکرا. خەڵکەکە باسی ڕووداوەکانی سەردەمی نەفامییان دەکرد، هۆنراوەیان دەخوێندەوەو وتەی شیرینیان دەگوت. پێغەمبەری ئازیزیشﷺ تەنها بە زەردەخەنەوە گوێی لەقسەکانیان دەگرت. هەندێ کاتیش غەنیمە (دەستکەوتی جەنگ)، یاخود ئەو یارمەتیانەی دابەش دەکرد کە وەك موچە دەدرا بە هەندێ کەس.

لەهەندێ ڕیوایەتەوە پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەرﷺ کاتێك خۆر کەمێك بەرزدەبوویەوەو ڕۆژ بەرەو پێش دەچوو، هەندێ جار چوار و هەندێ جاریش هەشت ڕکعات نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد. دوایی دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەو بەئیشی ماڵەوە سەرقاڵ دەبوو. ئەگەر هەیبوایە جلە دڕاوەکانی دەدورییەوە، پێڵاوی هەڵوەشاوی خۆی بەدەستە پیرۆزەکانی خۆی نۆژەن دەکردەوەو شیری دەدۆشی. وەك ئیمام نوێژی نیوەڕۆی لە مزگەوت ئەنجام دەدا.

لـەدوای ئـەوە بەکێشـەو گرفتـەکانی خەڵکـەوە خـەریك دەبـوو. ئەگـەریش نەخۆشـێك، زەماوەنـدێك یـاخود میوانداریيـەك هەبوایـە، بەوانەوە سەرقاڵ دەبوو.

دوای ئەنجامدانی نوێژی عەسر، دەچووە لای هەریەك لـە خێزانـە بەڕێزەکانی، کەم کەم لایـان دەمایـەوەو لـەبارودۆخیانی دەپرسـی. دوای ئەوە سەرەی کامیان بهاتایـە شـەوی لای ئـەو بەسـەر دەبـرد. هــەموو خێزانــەکانی لــەوێ کــۆدەکردەوەو دادەنیشــتن و قســەو گفتوگۆیان دەکرد.

پاشان بۆ ئەنجامدانی نوێـژی خـەوتنان دەڕۆیشـت بـۆ مزگـەوت. دوای نوێژەکەی دەگەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و، کاتـێ خیزانـەکانی بەجێیان دەهێشت و دەچوونە ژووری خۆیان، ئەویش دەنوست.

پێغەمبــەری خــواﷺ لــەدوای نوێــژی خەوتنانــەوە حــەزی بــە قسەکردن نەدەکرد.

لەکاتی ئاساییدا لـە مەدینـە، ڕۆژێکـی ئاسـایی پێغەمبـەرﷺ بـەم شێوەیە تێدەپەڕی.

"ئەو زەرەرو زیانەی کە دوو گورگی برسی لە ڕانە مەڕێکی دەدەن کاتێك پـەلاماریان دەدەن، لـەو زەرەرە زیـاتر نیـە کە مرۆڤێك بە تەماعی دونیا دەیدات لە دین"[1]

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

## ئامۆژگاری پێغەمبەرﷺ بۆ ئەو هاوەڵانەی که دەیانویست خۆیان لەکاری خێرو چاکەدا ببیننەوە چی بوو؟

پێغەمبەرﷺ لە هەر شوێنێك بوایە هاوەڵان داوای ئامۆژگارییان لێ دەکردو پێغەمبەری ئازیزیشﷺ لەسەر ئەو بابەتانەی کە پێویستیان بوو ئامۆژگاری دەکردن. ئەمانەش چەند نموونەیەکن:

سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوەو دەڵێت:"بە پێغەمبەری خوام وتﷺ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ! ئامۆژگاریم بکە تا گوێڕایەڵی بم".

ئەویش پێی فەرموو:"بڵێ (الله) خودامەو پاشان لەسەر ڕێی ڕاست بڕۆ!".

جارێکی دیکە پێم وت: "ئەی پێغەمبەری خودا! لەهەموو شتێك زیاتر لەچی دەترسیت کە مایەی زەرەر بێت بۆ من؟"، بەدەستی زمانی خۆی گرت، پاشان فەرمووی:"ئەمە!".

لەسەر ئەوەی کە لە گفتوگۆکانیدا باسی لە گرنگی خۆپاراستن و دوورکەوتنەوەی لە گوناه کردووە.

ئــەبو ئومامــە دەگێڕێتــەوەو دەڵێــت: پێغەمبــەری خــوداﷺ فەرموویەتی: "من گرەنتی کۆشکێك لە لێواری بەهەشت دەکـەم بـۆ ئەو کەسەی کە ئەگەر چی لەسـەر هـەقیش بێـت واز لـە دەمـەقاڵێ بهێنێـت. ئەوکەســەش کــە تەنانــەت بــۆ گاڵتــەش درۆ نــەکات لەناوەڕاستی بەهەشت وە ئەوکەسەی کە خوو ڕەوشتی جـوان بێـت لەبەرزترین پلەی بەهەشت گرەنتی کۆشکێکی دەکەم".[١]

## ئەو بنەمایانە چی بوون کە سەروەرمان جێبەجێی دەکردن وەك ڕێ نیشاندانی خەڵك بۆ بەڕێزی و ڕەوشت جوانی؟

حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە:

- "پیاوێك کە بەخووڕەوشتی خراپـی ناسـرابوو داوای مۆڵـەتی کرد تابچێتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ.

پێغەمبـەرﷺ زۆر بـەجوانی پێشـوازی لێ کـردو زۆر بـە زمـانێکی شـیرین گفتوگـۆی لەگـەڵ کـرد. کاتێـك کــە پیاوەکــە ڕۆیشــت، بەپێغەمبەرمﷺ وت:

١- پێشەوا ئەبو داود ڕیوایەتی کردوە.

- "ئـەی پێغەمبـەری خـوا! تـۆ بـەڕووی ئـەو کابرایـەدا دەم بەخەندە بوویت و زۆر بەباشی مامەڵەت لەگەڵدا کرد!"

ئەویش وەڵامـی دایـەوەو فـەرمووی:-"ئـەی عائیشـە! چ کاتێـك منت بە ڕوو گرژی و مۆنی بینیوە؟ خراپترین مـرۆڤ لـەڕۆژی دواییـدا لای خوای گـەورە ئـەو کەسـەیە کـە خـەڵك لەبـەر گـرژو مـۆنی لێـی دوورکەوتوونەتەوە".[١]

## بۆچی پێغەمبەری خواﷺ
## هانی خەڵکی دەدا بۆ نوێژکردنی بە کۆمەڵ؟

ئایا پاداشتی نوێژ ئەنجامدان لە مزگەوت چەندە؟

پێغەمبـەری خـواﷺ هەمیشـە گرنگـی ئـەوەی بـۆ خـەڵك شـی کردووەتەوە کە بە کۆمەڵ لە شوێنێکدا خواپەرستی بکەن.

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە:"پێغەمبـەری خـوداﷺ فەرموویـەتی: "نوێژ لە جەماعەتدا خێری زیاترە لەنوێژەکەی لەماڵی خۆیدا یان لە دوکان و بازاڕەکەیدا بە بیست و پێنج پلە، ئەویش لەبەرئەوەیـە کـە یـەکێك لـەئێوە کاتێـك کـە دەسـتنوێژی گـرت بەباشـی و، هـات بـۆ

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

مزگەوت و هیچ مەبەستێکی نەبوو تەنها نوێژکردن نەبێت و، هیچ شتێك پاڵنەرو هاندەری نەبوو تەنها نوێژەکە نەبێت، پاشان هەر هەنگاوێك کە دەینێت پلەیەکی پێ بەرز دەکرێتەوەو، تاوانێکیشی بۆ پێ هەڵدەوەرێت تا دەچێتە مزگەوتەکەوە، جا ئەگەر چووە ناو مزگەوتەکە ئەوا ئیتر لە نوێژدایە مادەم لەپێناو نوێژکردندا لەمزگەوتەکەدا ماوەتەوەو، فریشتەکانیش صەڵاوات لەسەر هەر یەکێکتان دەدەن مادەم لەو مەجلیسەدا ماوەتەوە کە نوێژەکەی تیادا کردووە. دەڵێن: خودایە لێی ببورە، خودایە بیبەخشە، خودایە تۆبەی لێ وەرگرە، بەمەرجێك ئازاری کەسی تێدا نەدات یان دەستنوێژەکەی بەتاڵ نەکاتەوە".[1]

## ئامۆژگاریە گرنگەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ موعاذ چی بوو؟

ئەو کردەوەیە چیە کە لە ئاگری دۆزەخ بەدوورمان دەگرێت؟

موعاذی کوڕی جەبەل دەگێڕێتەوەو دەڵێت:"جارێکیان بەرێکەوت چاوم بە پێغەمبەری خواﷺ کەوت و بەیەکەوە بەرێدا ڕۆیشتین. پێم وت:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ کارێکم پێ بڵێ کە لەئاگری دۆزەخ دوورم بخاتەوەو بە بەهەشتی بەرینم بگەیەنێت".

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:"شتێكی گرنگت پرسی. ئەمە بۆ كەسێك كە بەندایەتی خوای گەورەی بەنسیب بووبێت كارێكی ئاسانە. خوای گەورە بپەرستە، هیچ شتێك مەكەرە هاوبەش بۆی، نوێژ بكە، زەكات بدە، مانگی ڕەمەزان ڕۆژووەكانت بگرەو حەجی ماڵی خودا بكە".

بەردەوام بوو لەسەر وتەكانیو فەرمووی: "ئایا دەتەوێت دەروازەی خێرو چاكەت نیشان بدەم؟"

منیش وتم:"بەڵێ! ئەی پێغەمبەری خودا!"

فەرمووی:"ڕۆژوو پەردەیە (بۆ ئاگری دۆزەخ)، خێر تاوانەكان دەسڕێتەوە هەروەك چۆن ئاو ئاگر دەكوژێنێتەوە... شەونوێژ دروشمی پیاوچاكانە".

وە ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ السجدة: ١٦.

واتە: لاتەنیشتیان لە شوێنی نووستنی شەویان بەرز ئەبێتەوە واتە بەشەو ڕاست ئەبنەوە بۆ خواپەرستی و لە ترسی سزای دۆزەخ و، بە هیواو تەماعی نیعمەتی بەهەشت لە خوای خۆیان ئەپاڕێنەوەو خوا چیی دابنێ لێی خەرج ئەكەن لەڕێی ئەودا.

دوای ئەوە لێی پرسیم:"دەتەوێت باشترین كارو لوتكەو كۆڵەكەی ئەم دینەت پێ بڵێم؟"

وتم: "بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا".

فەرمووی: "کەواتە گوێم بۆ ڕابگرە!"

بـۆی ڕوونکردمـەوەو فـەرمووی: "سـەری ئـەم ئایینـە ئیسـلامە، کۆڵەکەکەی نوێژە، لوتکەکەشی جیهادە".

پاشان بەم شێوەیە بەردەوام بوو و فـەرمووی: "باشـترین کـارت پێ بڵێم کە تەواوکەری هەموو ئەمانەیە؟"

وتم: "بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوداﷺ!"

ئامـاژەی بـۆ زمـانی کـردوو، فـەرمووی:"خـاوەنی ئەمەبـە (واتـە بیپارێزە)".

لێم پرسـی:"ئـەی پێغەمبـەری خـوداﷺ ! ئایـا ئێمـە بەرپرسـیار دەبین لەو شتانەی کە دەیڵێین؟"

فەرمووی:"ئەی موعاذ (ئایا ئەو شتەی کە مرۆڤەکان بە ڕوویانـدا فـڕێ دەداتـە نـاو ئـاگری دۆزەخ، جگـە لـەوەی بـەهۆی زمانیانـەوە پەیدای دەکەن، شتێکی دیکەیە؟"[1]

باوەڕدار، تا دەگاتە مەنزڵی خۆی لە بەهەشت، لـەو دانـاییو وتـە خێرانـە تێـر نـاخوات کـە بـەر گوێی دەکەون.[2]

---

١- پێشەوا ترمزی لە باسی باوەڕدا ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا ترمزی لە باسی (زانست)دا ڕیوایەتی کردوە.

# پێغەمبەری خودا
# پەیوەندی نێوان خواست و ئەجەلی
# چۆن ڕوونکردووەتەوە؟

پێغەمبەری خوایﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە وابەستەبوون بەخواست و ئاواتی دوورو درێژخایەنەوە کارێکی باش نیە.

لەئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە دەڵێت: پێغەمبەری خوداﷺ لەسەر زەوی هێڵێکی کێشاو فەرمووی: "ئەم هێڵە ئامانژە بۆ ئەجەلی مرۆڤ دەکات".

دوای ئەوە هێڵێکی لەوە درێژتری کێشاو فەرمووی: "ئەمەش ئامانژە بۆ خواست و ئاواتی مرۆڤ دەکات".

بەردەوامی بە قسەکانیداو فەرمووی: "کەواتە مرۆڤ کە بەم شێوەیە بێت (واتە پێش ئەوەی بگات بە خواستەکانی) کت وپڕ دەگاتە ئەوەی کە لەو نزیکترە (واتە ئەجەلەکەی)".[١]

بورەیدە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: "پێغەمبەری خوایﷺ دوو چیلکەی لە دەستدا بوو، فڕێیدان (یەکێکیان بۆ دوورو ئەوی تریان بۆ نزیك) و پاشان پرسی: "ئایا دەزانن ئەمەو ئەوە دەلالەت لەچی دەکەن بۆ ئێوە؟"

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و ترمزی ڕیوایەتیان کردوە.

خەڵکەکە وتیان:"خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن".

فەرمووی: "ئەوەیان (ئەوەی کە بۆ دوور هەڵیدابوو) ئاوات و خۆزگەکانی مرۆڤە، ئەمەش (کەوتبووە نزیك) ئەجەلە".

مرۆڤ کاتێك لە هەوڵ و تەقەلادایە بۆ گەیشتن بە خواست و ئاواتەکانی، پێش ئەوەی پێیان بگات وەفات دەکات".[١]

## هەستیاری پێغەمبەرﷺ چۆن بوو سەبارەت بە گێڕانەوەی قەرز بەر لە مردن؟

سەروەرمانﷺ دەربارەی پیاوێك کە لە کۆتایی ژیانیدا قەرزبار بووەو وەفاتی کردووە، بەمجۆرە هەستی خۆی دەبڕیوەو ئەم وتانەی فەرمووە:

لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕدرێتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لەسەر جەنازەیەك نوێژی نەدەکرد کە پێش مردنی قەرزی لەسەر بووبێت.

ڕۆژێك جەنازەیەك هێنرا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "هیچ قەرزێکی لەسەرە؟"وتیان:"بەڵێ، دوو دینار قەرزدارە".

فەرمووی: " نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن".

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

هاوەڵێك لە ئەنسارەكان كە ناوی ئەبو قەتادە بوو وتی: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ من ئامادەم ئەو دوو دینارە قەرزەی بۆ بدەمەوە". پێغەمبەرﷺ بەوە ڕازی بوو، پاشان نوێژی لەسەر جەنازەكە كرد.

كاتێك خوای گەورە فەتحەكانی لەسەر پێغەمبەر ئاسان كرد فەرمووی:"من نزیكترو لەپێشترم لەخودی باوەڕداران بۆ خۆیان، جا هەركەسێك لە باوەڕداران وەفاتی كردو قەرزار بوو ئەوا دەبێت بۆی بدەمەوە، هەركەسێكیش ماڵ و سامانی بەجێهێشت لەدوای دەبمە میراتگری"[١].

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"گەورەترین گوناه لەدوای گوناهە گەورەكان كە خوای گەورە قەدەغەی كردوون، ئەو كەسە قەرزدارەیە بێ ئەوەی سامانێكی جێهێشتبێت كە قەرزەكەی پێ بدرێتەوە بگەڕێتەوە خزمەت خوای گەورە"[٢].

لە سومرەی كوڕی جوندوبەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕدراوەتەوەو دەڵێت:"پێغەمبەری خودا ڕووی قسەكانی لە ئێمە كردو لێی پرسین: "لە نەوەكانی فلان كەس لێرەیە؟"

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی كردوە.

٢- پێشەوا ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە.

کەس وەڵامی نەدایەوە دیسان پرسیاری کرد:"لەنەوەکانی فلان کەس هەیە لێرە؟"

ئەمجارەش کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆ جاری سێیەم پرسیاری کرد:"لە نەوەکانی فلان کەس لێرەیە؟"

ئەمجارەیان پیاوێك هەستایە سەرپێ و وتی:" من لێرەم، ئەی پێغەمبەری خودا".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"بۆچی دووجاری پێشوو وەڵامت نەدایەوە؟ گومان لەوەدا نییە کە من بۆ خێرو چاکە نەبێت ناوتان ناهێنم، هاورێکەتان لەسەر قەرزەکەی رێی لێ گیرا (نەخرایە بەهەشتەوە)".

سومرە دەڵێت:"من ئەو پیاوەم بینی کە هەموو قەرزەکانی ئەو پیاوەی دەدایەوە. بەجۆرێك ئیتر هیچ کەس نەما شتێکی لای ئەو مابێت و هیچی لێ بوێت".[1]

---

١- پێشەوا نەسائی ریوایەتی کردوە.

# ئامۆژگاریەکانی

# پێغەمبەری خواﷺ سەبارەت

# بە دواخستنی دانەوەی قەرز چی بوو؟

ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"دواخستنی دانەوەی قەرزی دەوڵەمەند ستەمە.[1]

لە ئەبو رافیعەوە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ وشترێکی گەنجی بە قەرز وەرگرتبوو کاتێك خۆی چەند وشترێکی بۆ هات بۆ خێر فەرمانی بە من کرد کە وشترە گەنجەکەی پیاوەکە بگەڕێنمەوە، منیش پێم وت:"لەنێو وشترەکاندا لە وشترێکی جوان کە ٦ساڵی پڕکردوەتەوە، وشترێکی باشترم نەدۆزییەوە".

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:"دە ئەو وشترە بدە بەو پیاوەی کە وشترەکەم بە قەرز لێ وەرگرتبوو، بێگومان باشترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە قەرزەکەی بە باشترین شێوە دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی".[2]

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆش بوێت، ئەوا لە پۆچوون لەناو دونیا دەیپارێزێت، هەروەك چۆن ئاو لە نەخۆش قەدەغە دەکرێت.[1]

## ئەو ئامۆژگاریانەی پێغەمبەرﷺ بۆ موعاذی کوڕی جەبەل چی بوون کە هەموو موسوڵمانانیش دەگرێتەوە؟

لە ژیانی ڕۆژانەی پێغەمبەرداﷺ، زۆرجار لە دەرەوەی شارەوە خەڵك دەهاتنە خزمەتی‌و ئەویش بە جوانترین شێوە پێشوازی لێ دەکردن و خزمەتی دەکردن. بەهۆی خێرا بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتانەی کە تازە هاتبوونە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، چەند کەسانێکی خاوەن پەروەردەو ڕەوشتی تایبەتیان وەك والی بۆ ئەو شوێنانە دەنارد.

ئەوانیش کاتێك مەدینەیان جێدەهێشت، داوای ئامۆژگاری و ڕێ نیشاندانیان لە پێغەمبەری خواﷺ دەکرد، ئەویش بەردەوام ئامۆژگاری دەکردن لەسەر ئەو شتانەی لەڕێیاندا پێویستیان پێی دەبێت.

ئەمەش ئامۆژگاری پێغەمبەرە ﷺ بۆ یەکێك لەو هاوەڵە بەڕێزانە، موعاذی کوڕی جەبەل:

موعاذ وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە!".

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو:"لە هەر شوێنێك و لە هەر بارودۆخێکدا بوویت، هەمیشە لەخوای گەورە بترسە!".

موعاذ وتی:"زیاتر ئامۆژگاریم بکە ئەی پێغەمبەری خوا!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"هەرکاتێك تاوانت کرد، دەست بەجێ کارێکی چاکەی بە دوادا بکە، تا تاوانی پێشووت بسڕێتەوە".

موعاذ وتی:"ئەی پێغەمبەری خوا کەمێك زیاتریش ئامۆژگاریم بکە!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"بە خوو ڕەوشتی جوان مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکە، ئەی موعاذ! تۆ دەچیتە نێو قەومێك کە (ئەهلی کیتابن) ئەوان لێت دەپرسن کلیلی بەهەشت چیە؟ پێیان بڵێ، کلیلی بەهەشت بریتییە لە(أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له).

موعاذ وتی:"ئەی ئەگەر کاتێك دەربارەی شتێك پرسیارم لێ کرا کە نە لە قورئاندا هەبوو و نە لە تۆشم بیستبوو، ئەگەر ئەو مەسەلەیە هێنرایە لای من چارەسەری بکەم، بۆ ئەم کارە چ ئامۆژگارییەکەم دەکەیت؟".

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:"لە پێناو خوای گەورەدا سادەیی و بێ فیزی نیشان بدە، خوای گەورە بەرزت دەکاتەوە. ئەگەر لە

شتێك دڵنیا نەبوویت حوکم مەدە! هەر شتێك کە ئەستەم و ئاڵۆز بوو بەلاتەوە، لە خەڵکی شارەزا بپرسە، ڕاوێژ بکە، شەرم مەکە! دوایین جار ئینجا ئیجتیهادی تێدا بکە. بە دڵنیاییەوە خوای گەورە بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمویت دەکات. کاتێك شتێك ئاڵۆزو بێ چارەسەر دەبێت لەلات، چاوەڕێ بکە تا بۆت ڕوون دەبێتەوە، یاخود بە پەیامێك بۆ منی بنێرە. لەم بارەیەوە هەرگیز لەخۆتەوە هەڵسوکەوت مەکە! ئامۆژگاریت دەکەم بەنەرم و نیانی هەڵسوکەوت بکەیت".

## ئەو شتانەی کە سوودیان هەیە بۆ مرۆڤ، تەنانەت دوای مردنیشی:

ئەبو موعاذ کوڕی ئەنەس دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك زانستێك فێری خەڵکی بکات، ئەوا پاداشتی ئەو کەسانەیشی بۆ دەنوسرێت کەبەو زانستە کاریان کردووە، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەو کەسانە کەم ببێتەوە".

ئەبو قەتادە لە باوکیەوە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"باشترین شت کە مرۆڤ دوای خۆی (دوای مردنی) جێی دەهێڵێت ئەم سێ شتەیە: منداڵێکی صالح کە

دوای خۆی دوعای بۆ بکات، صەدەقەیەك کە دەستاو دەست بڕوات، یاخود زانستێك کە دوای خۆی کاری پێ بکرێت".

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"ئەو کردەوە خێرو چاکانەی کە مرۆڤی موسوڵمان لە ژیانیدا ئەنجامی دەدات و پاش مردنیش هەر پاداشتی بۆ دەنوسرێت بریتین لە: زانستێك کە فێری خەڵکی کردبێت و بڵاوی کردبێتەوە، منداڵێکی صاڵح کە داوای لێخۆش بوون و نزای بۆ بکات، کتێبێك کە دوای خۆی سوودی لێ ببینرێت، مزگەوتێك کە بینای کردبێت، بینایەك کە بۆ ڕێبوارانی دروست کردبێت، شوێنێکی ئاو خواردنەوە، خێرێك کە لە ژیانیدا لەکاتی لەش ساغیدا بەخشیبێتی، ئەمانە ئەو شتانەن کە مرۆڤ پاش مردنیشی پاداشتەکەی پێدەگات".

## بۆچی پێویستە لەسەرمان
## لەگەڵ دایك و باوكماندا باش بین؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ پرسی: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ كێ لە هەموو كەس شایستەترە كە چاكەكاربم لەگەڵیدا؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "دایكت!"

پیاوەكە وتی: "دواتر كێ؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "دایكت!".

پیاوەكە دیسان پرسیاری كرد: "پاشان كێ؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "دایكت!".

ئەم جارەش پیاوەكە پرسی: "كێی تر؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "باوكت!".

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "سەرشۆڕبێت، پاشان سەرشۆڕبێت، پاشان سەرشۆڕبێت".

لێیان پرسی: " كێ، ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"کەسێك گەشتبێت بەباوك و دایکی یان یەکێکیان لەکاتی پیریداو پاشان نەچوبێتە بەهەشتەوە. (واتە چاك نەبوبێت لەگەڵیاندا)"[1].

پێغەمبەری خواﷺ ڕەزامەندی خوای گەورەی بە ڕەزامەندی دایك و باوکەوە بەستووە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"ڕەزامەندی خوای گەورە لە ڕەزامەندی دایك و باوکدایەو، تووڕەبوونیشی لە تووڕەیی و نارازیبوونی ئەواندایە"[2].

پێغەمبەری خوا بەرامبەر بە منداڵە کچەکانی زۆر بەسۆزەوە مامەڵەی دەکردو بۆ بەباش پێگەیاندنیان، هەموو توانایەکی خۆی دەخستە گەڕ.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ هەردوو پەنجەی خستە تەنیشت یەك و فەرمووی:"هەرکەسێك دوو منداڵی کچ تا تەمەنی باڵغ بوون پەروەردە بکات و باش پێیان بگەیەنێت ئەوا لە بەهەشتدا لەگەڵمدا وەك ئەو دوو پەنجەیە"[3].

---

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

٣- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

ئەبو سەعد (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك سێ کچ یاخود سێ خوشك، یاخود دوو کچ یان دوو خوشك پێبگەیەنێت و کەمتەرخەمی نەکات لە پەروەردەکردنیاندا بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات و بیاندات بە شوو، بەهەشتی بەدەست هێناوە".[1]

ترمذی (ڕەزای خوای لێبێت) لە ڕیوایەتێکی دیکەوە، لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت:"مرۆڤ یەك جار پەروەردەی منداڵەکەی بکات باشترە بۆی لەوەی کە مشتێك خواردنی بۆ دابین بکات و بیداتێ".

هێورو مامناوەندبە لە خۆشویستنی خۆشەویستەکەتدا، چونکە لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕقت لێی بێت، مامناوەندیش بە لە دژایەتی و ڕق لێبوونی دژەکەتدا، چونکە لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێت بە هاوەڵ و خۆشەویستت.[2]

---

١- هەردوو پێشەوا ئەبوداود و ترمزی ڕیوایەتیان کردوە.

٢- پێشەوا ترمزی لە باسی چاکەدا ڕیوایەتی کردوە.

# وێناکردنی پێغەمبەرﷺ

# بۆ بەهەشت چۆن بوو؟

پێغەمبەرﷺ هەمیشە بە تاسەیەکی زۆرەوە باسی بەهەشتی بۆ خەڵك دەکرد. عوبادەی کوڕی صامت (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

"لەبەهەشتدا ١٠٠ پلە هەیە، نێوان هەر پلەیەك و پلەیەکی دیکە وەك ماوەی نێوان زەوی و ئاسمان وایە. بەرزترین پلە لەم پلانەدا فیردەوسە، چوار ڕووبارەکەی بەهەشت لەوێوە هەڵدەقوڵێن. لەسەرو فیردەوسیشەوە (عەرش) هەیە. کاتێك لە خوای گەورە دەپاڕێنەوەو داوای بەهەشت دەکەن، ئەوا داوای (فیردەوس) بکەن".[١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:"خوای گەورە فەرمانی بەخۆی داوەو فەرموویەتی: "من خاوەن پلەیەکی زۆر مەزنم، چەند خۆشی و نیعمەتێکم ئامادەکردووە بۆ بەندە صالح و گوێڕایەڵەکانم کە نە هیچ چاوێك بینیویەتی و نە هیچ گوێیەك بیستویەتی و نە بە خەیاڵی هیچ کەسێکیشدا هاتووە".

---

١- پێشەوا ترمزی لە باسی بەهەشتدا ڕیوایەتی کردوە.

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) درێـژەی بـە قسـەکانیداو وتـی:"ئەگەر دەتانەوێت ئەم ئایەتـە پـیرۆزە بخوێننـەوە: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٧.

واتە: هیچ یەکێ لەوانە نازانێ لەپاداشی ئەو کردارە چاکانەدا لەم دنیادا ئەیانکردن، چیی بەبێ ئاگاداریی خۆی بۆ ئامـادە کـراوە لـەو دنیادا لەو شتانەی چاویان لە خۆشییانا پێ فێنك ئەبێتەوە.

سەعد دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك لە پێغەمبەری خوام پرسیﷺ :"ئـەی پێغەمبەری خواﷺ مرۆڤەکان لەچی دروستکراون؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"لە ئاو!".

وتم:"ئەی بەهەشت؟ ئەو لەچی بەدیهێنراوە؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"لەخشتی زیوو خشـتی زێـڕ. نێوانیشـیان بـە میسـکی بۆنـدار گـیراوە. چـەوو خـۆڵی بەهەشـت لـە مـرواری و یاقوتـە، خاکەکەشـی زەعفەرانـە. ئـەوەی بچـێتە بەهەشـتەوە ئـەوا گەیشـتووە بـە خێـرو خۆشـی و نیعمـەت، زیـان نابینێـت، نـەمری بەدەست دەهێنێت، ڕووبەڕووی مەرگ نابێتەوە. پۆشاکەکانی کۆن نابن، گەنجێتی لەدەست نادات".

پێغەمبـەرﷺ بـەم جـۆرە بـەردەوامی بـە وتەکانیـداو فـەرمووی: "سێ کەس هەن، کە هەرگیز نزاکانیان ڕەت ناکرێتەوە:

– پێشەوایەکی دادپەروەر.

- ڕۆژووەوان لەوساتەی ڕۆژووەکەی دەشکێنێت.
- کەسێك کە ستەمی لێ کرابێت.

خوای گەورە دوعاو پاڕانەوەی ستەملێکراو بەرزدەکاتەوە بۆ سەرو هەورەکان و دەرگاکانی ئاسمان بەڕوویاندا دەکاتەوەو خوای گەورە دەفەرموێت:"سوێند بە عیززەت و گەورەیم! هەرچەنێك کاتیش تێپەڕ بێت، من ڕۆژێك هەر ئەم نزایەت قبولّ دەکەم بەهەر جۆرێك بێت".[١]

بورەیدە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پیاوێك لە پێغەمبەری پرسیﷺ:"لەبەهەشتدا ئەسپ هەیە؟"

پێغەمبەریشﷺ فەرمووی:"کاتێك خوای گەورە تۆی خستە بەهەشتەوە، ئەگەر بتەوێت لەسەر پشتی ئەسپێك لەیاقووتی سووری گەش بەناو بەهەشتدا بگەڕێیت، ئەوا ئەو بۆ هەر شوێنێك بتەوێت هەڵتدەفڕێنێت".

لەسەر ئەمە پیاوێکی دیکەش پرسی: "لەبەهەشتدا وشتر هەیە؟".

بەلاّم پێغەمبەرﷺ بۆ ئەم پرسیارە هەمان وەلاّمی پرسیاری پێشووی نەدایەوە، بەڵکو فەرمووی:"ئەگەر خوای گەورە بتخاتە

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

بەهەشتەوە، ئەوا هەر شتێك دڵ پێی خۆش بێت و هەر شتێك چاو حەزی لێ بکات دەستەبەر دەبێت".[1]

## پێغەمبەرﷺ دەربارەی زۆر یادکردنی خوای گەورە بە نهێنی چی فەرمووە؟

عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ یادکردنی خوای گەورەی بە نهێنی و بەشێوەیەك کە فریشتە یاداشت نووسەکان گوێبیستی نەبن، بەباش دادەناو دەیفەرموو:

- "کاتێك ڕۆژی قیامەت دێت، هەموو دروستکراوەکان بۆ حساب کردن کۆدەکرێنەوەو فریشتە یاداشت نووسەکان هەموو ئەو شتانەی نووسیویانە دەیهێنن، خوای گەورە پێیان دەفەرمووێت:"سەیربکەن بزانن ئەم بەندەیەم هیچ کارێکی دیکە ماوە ئەنجامیدابێت؟" فریشتەکانیش دەڵێن:"ئەی پەروەردگارمان ئێمە هەرشتێك زانیبێتمان نوسیومانە، هیچمان نەهێشتووەتەوە نەمان نوسیبێت".

خوای گەورەش بە بەندەکەی دەفەرمووێت:"تۆ چەند شتێکت هەیە لەلای من شاردوتنەتەوە، بەڵام تۆ نازانیت ئەوانە چین، با من

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

ئەوانـەت بـۆ شـی بکەمـەوەو پێـت بڵـێم. ئـەو شـتە بریتییـە لـە زیکرکردنی نهێنی"[1].

## گرنگی شەرم و شکۆ و ڕەوشت بەرزی چیە؟

لە ئەبو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

- "یـەکێك لـەو وتانـەی لەسـەردەمی یەکـەمین پێغەمبـەرەوە بەرگوێی مرۆڤەکان دەکەوێت ئەمەیە، ئەگەر شەرم ناتگرێـت هەرشتێك پێت خۆش بوو بیکە !".

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: گوێم لـە پێغەمبـەری خـوا بـووﷺ فـەرمووی: "گومـان لـەوەدا نیـە کـە پلـەو پایـەی موسوڵمانێك کە خوو ڕەوشتی جوان بێت لای خوای گـەورە دەگاتـە پلەوپایـەی موسـوڵمانێك کـە (بـەڕۆژ) ڕۆژوو بگرێـت و (شـەو) بـە پەرستنی خوای گەورەوە بەسەربەرێت".

---

١- (أبو يَعْلى) ڕیوایەتی کردوە.

لە ئەبو دردائـەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) پێمـان گەیشـتووە کـە پێغەمبەری خـواﷺ فەرموویـەتی:"لـە تـەرازووی کردەوەکانـدا هـیچ شتێك نیە لە خوو ڕەوشتی بەرز قورسایی زیاتر بێت".

## پێغەمبەری خواﷺ
## دەربارەی کۆتایی هاتنی
## پلەو پایەی دونیایی چی فەرمووە؟

پێغەمبەری خواﷺ بەردەوام ئامۆژگاری ئەوەی کردووین کە هـەر شتێك لە دونیادا بەدەسـت دەهێنرێـت، ڕۆژێـك هـەر دێـت لەدەسـت دەچێت، بۆیە هەرکەسێك بە شتی دونیاییەوە بنازێت و لەخۆی بایی بێـت، ڕۆژێـك هـەردێت کـە تووشـی شکسـت و لەناوچـوون دەبێـت، هـەروەها یـەکێك لـە مەرجـەکانی ئـەوەی کـە مرۆڤێکـی بـاش بیـت ئەوەیـە کـە بـەهۆی ئـەو شـتانەی لـە دونیـادا بەدەسـتمان هێنـاوە خۆمان بەسەر خەڵکانی دیکەدا بە باشترو بـەرزتر نیشـان نـەدەین و لە هەڵەیی ئەم کارە ئاگاداری کردوینەتەوە.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خـواﷺ وشترێکی هەبوو بەناوی "العبدة" کە لە پێشبڕکێدا هیچ وشترێ پێی نەدەگەیشـتەوە. ڕۆژێـك کابرایـەکی دەشـتەکی لەسـەر پشـتی

حوشترەکەی هات و لەگەڵ (عبدة) دا کەوتە پێشبڕکێ و (عبدة) ی بەزاند. ئەم بەزاندنە تاڕادەیەك قورس دەهاتە پێش چاو بەلای هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوەﷺ.

لەسەر ئەمە پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:"دووبارە نزم نیشتنەوەی هەرشتێك کە لە دونیادا بەرز دەبێتەوە، یاسای خوای گەورەیە".

هەروەها لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"لەدونیادا هەر شتێك کە بەرز دەبێتەوە، دووبارە نزم بوونەوەی یاسای خوای جلیل و عزیزە".

لە ڕەوشتە جوانەکانی مرۆڤی موسوڵمان ئەوەیە، خۆی هەڵنەقورتێنێت لەکارێك کە پەیوەندی پێیەوە نییە.[1]

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

# نهێنی به ئاشكرا ئەنجام نەدان و نەگێڕانەوەی تاوان چیە؟

سەروەرمانﷺ به ئاشكرا ئەنجامدانی تاوان و گێڕانەوەی قەدەغه كردووه.

ئەبو هورەیره (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوه: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەموو ئوممەتەكەم بەر لێخۆشبوون دەكەون، جگه لەو كەسانەی كه بەئاشكرا تاوان ئەنجام دەدەن. كاتێك كەسێك بەشەو تاوانێك ئەنجام دەدات، خوای گەوره بۆی دادەپۆشێت. بەڵام كاتێك ڕۆژ دەبێتەوه دەڵێت: ئەی فلان، من ئەمشەوی ڕابردوو واو وام كرد (فلانه ئیشم ئەنجامدا). بەم شێوەیه ئەو تاوانەی كه خوای گەوره بۆی پۆشیوەو شاردویەتیەوه بەشەو، خۆی كه ڕۆژ دەبێتەوه پەرده لەسەر تاوانەكەی لادەبات و ئاشكرای دەكات. كەواته ئەمەش جۆرێكه له ئاشكرا ئەنجامدانی تاوان".[1]

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان كردوه.

# ئەو كەسانە كێن

## كە دەتوانن بچنە بەهەشتەوە؟

ئەبو ذەڕی غەفاری (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: جارێك پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) هاتە خزمەتم و مژدەی دامێ و گوتی: هەركەسێك لە ئوممەتەكەت بمرێت و هیچ جۆرە شتێك نەكاتە هاوەڵ بۆ خوای گەورە، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە".

منیش بەسەرسوڕمانەوە لێم پرسی:"تەنانەت ئەگەر دزی و داوێن پیسیشی ئەنجام بدات؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەگەر دزیش بكات و داوێن پیسیش ئەنجام بدات". منیش دیسان پرسیم:" واتە ئەگەر دزی و داوێن پیسیش بكات، وایە؟".

فەرمووی:" بەڵێ، تەنانەت ئەگەر دزی و داوێن پیسیش بكات!".[١]

جارێك پێغەمبەرﷺ لە جەنگێك دەگەڕایەوە، ئافرەتێك منداڵەكەی لە باوەش گرت و چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ و لێی

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان كردوە.

پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا خۆشەویشتیی خوای گەورە بۆ بەندەکانی لە خۆشەویستی دایکێك بۆ کۆرپەکەی زیاترە؟"

پێغەمبەریشﷺ وەڵامی دایەوەو فەرمووی: "بەڵێ!".

ئافرەتەکە وتی: "هیچ دایکێك بەوە ڕازی نابێت کۆرپەکەی خۆی فڕێ بداتە نێو ئاگرەوە".

ئەم قسەیەی ئافرەتەکە زۆر کاری کردە سەر پێغەمبەری خواﷺ دەستی کرد بە گریان. پاشان سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: "خوای گەورە تەنها ئەو بەندانەی سزاو ئەشکەنجە دەدات کە لە فرمانی دەردەچن و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن".

## کاتێك ماڵئاوایی لە ژیان دەکەین پێویستە دوا وتەمان چی بێت؟

موعاذی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

– "هەرکەسێك دوایین وتەی (لا إله إلا الله) بێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە".[1]

---

١– پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

# ئەو کەسەی کە لەدواییدا دەبێتە موسوڵمان، تاوان و کردەوە چاکەکانی پێشووی چۆن هەڵدەسەنگێنرێت؟

ئـەبو سـەعید (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویەتی:

- "کاتێك بەندەیەك دێتە ناو ئایینی ئیسلامەوەو ئەمە لـە نـاخی دڵیەوە دەکات، ئـەوا ئـەو کـردەوە باشـانەی کـە پـێش موسـوڵمان بـوونی کردوویـەتی خـوای گـەورە بـۆی دەنوسـێت لای خـۆی و، لـە هەموو ئەو کردەوە خراپانەش خۆش دەبێت کە ئەنجامی داون".

ئەو کردەوانەشی کە دوای موسوڵمان بوونی ئەنجامی دەدات بەم شـێوەیە مامەڵـەی لەگـەڵ دەکرێـت: هـەر کردەوەیـەکی چـاکە کـە ئەنجامی دەدات، پاداشتەکەی بەلایەنی کەمەوە دە قـات تـا حـەوت سەد قات بۆ دەنوسرێت و بۆ هەر کارێکی خراپ کە ئەنجامی دەدات - لەحاڵەتێکدا ئەگەر خوای گـەورە لێـی خـۆش نـەبێت- ئـەوا هـەر بەیەك تاوان بۆی دەنووسرێت".[1]

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

# بەهەشت بۆ چ کەسێك واجبە؟

ئـەبو سـەعید (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خوای ﷺ فەرموویەتی:

-"هەرکەسێك بڵێت (الله) بەخوای خۆم، ئیسلام بە دیـن و محمـد بە پێغەمبەری خۆم هەڵدەبژێرم (لە ناخیـدا بەمـە ڕازی بێـت). ئـەوا بەهەشت لەسەر خۆی واجب دەکات".[١]

عوقبەی کـوڕی عـامر (ڕەزای خـوای لێبێـت)دەگێڕێتـەوە: کـاری لەوەڕاندنی وشترمان بەسەرەوە بوو (ئەم کارەمان بە نۆبە دەکرد). ڕۆژێـك سـەرەی لەوەڕاندنەکـە هاتـە سـەر مـن. لـە کۆتـایی ڕۆژدا وشـترەکانم دەهێنایـە دەرەوە بـۆ لەوەڕانـدنیان. کـە لەسـەرەکەی خۆم گەڕامەوە چوومە خزمەت پێغەمبەری خوای ﷺ. بە پێـوە قسـەی بۆ خەڵکەکە دەکرد. فریای ئەم بەشە لە قسەکانی کەوتم:

-"هیچ کەسێك نیە کە بەجوانی دەستنوێژ بگرێـت و دوو رکعـات نوێـژ بکـات و لـە نوێژەکەیـدا بـە هـەموو ئـارەزوو ڕۆحیـەوە بچێتە خزمەت خوای گەورە و بەهەشت لەسەر خۆی واجب نەکات".

(کاتێـك ئەمانـەم بیسـت) خـۆم پـێ ڕانـەگیراو وتم:"ئەمـە چـەند باشە!".

---

١- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

یەکێك لەو کەسانەی کە لەتەنیشتمەوە بوو کە گوێی لێم بوو وتی:"ئەوەی کە کەمێك پێش ئێستا فەرمووی لەوەش باشتربوو".

ئاوڕم دایەوە تا بزانم کێ بوو ئەم قسەیەی کرد. سەیرم کرد عومەری کوڕی خەتاب بوو(ڕەزای خوای لێبێت).

بەردەوامی بە قسەکانیداو وتی:"تۆم بینی کە کەمێك دەبێت هاتیت، پێش ئەوەی تۆ بێیت دەیفەرموو:"هەریەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت و بەجوانترین شێوە ئەمە ئەنجام بدات و پاشان بڵێت: أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، ئەوا هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بەڕوودا دەکرێتەوە، لە هەرکامێکیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە".

## ئەو کەسانە کێن

## کە لەئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێت؟

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك مسقاڵە زەڕڕەیەك ئیمان لە دڵیدا هەبێت ئەوا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری دەبێت".

# چ کەسێك تاوانەکانی

# دەسڕدرێتەوەو پلەی بەرز دەکرێتەوە؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"ئەو شتانەتان پێ بڵێم کە خوای گەورە کردوونی بە هۆکار بۆ سڕینەوەی تاوانەکان و بەرزکردنەوەی پلەکانتان؟".

وتیان:"بەڵێ! ئەی پێغەمبەری خوا!".

ئەویش بۆی ژماردین و فەرمووی:"بەتەواوی دەستنوێژگرتن با لەکاتی نارەحەتیشدا بێت، ئینجا هەنگاونانی زۆر بۆ مزگەوت پاشان چاوەڕێکردنی نوێژ لەدوای نوێژ، ئا ئەوەیە لەسەنگەردابوون و پابەندبوون بە فەرمانەکانی خوای گەورەوە"[1].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"ئەگەر بەندەی باوەڕدار دەستنوێژی گرت، دەموچاوی شۆرد، هەر گوناهێك کە بە تەماشاکردن بە چاوەکانی ئەنجامیداوە لەگەڵ ئاوەکەدا -یاخود لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا- هەڵدەوەرێت و دەسڕێتەوە. کاتێك دەستەکانی شۆرد ئەوا هەر تاوانێك کەبە

---

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

دەستەکانی ئەنجامیداوە لەگەڵ ئاوەکەدا -یاخود لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا- هەڵدەوەرێت و دەسڕێتەوە. کاتێك قاچەکانی دەشوات ئەوا هەر تاوانێك کە بەڕۆیشتن بە قاچەکانی ئەنجامیداوە لەگەڵ ئاوەکەدا -یاخود لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا- دەڕوات. تا پاك دەبێتەوە لە گوناھ".[1]

ئەبو ئومامە لە (عەمری کوڕی عەبەسە)وە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك لەئێوە هەرکاتێك دەستنوێژەکەی بگرێت و ئاو لە دەمی ڕابدات و ئاو لە لووتی وەربدات، ئەوا تاوانەکانی دەموچاوی و لووتی و دەمی هەڵدەوەرێنە خوارەوە، پاشان ئەگەر دەموچاوی شۆرد بەو شێوازەی کە خوا فەرمانی پێکردووە، ئەوا تاوانەکانی دەموچاوی لە لێواری ڕیشییەوە لەگەڵ ئاوەکەدا هەڵدەوەرێتە خوارەوە، پاشان هەردوو دەستی دەشوات تا ئەنیشکەکانی، ئەوا تاوانەکانی هەردوو دەستی لە پەنجەکانیەوە لەگەڵ ئاوەکەدا هەڵدەوەرێتە خوارەوە، پاشان هەردوو پێکانی دەشوات تا پاژنەکانی، ئەوکات تاوانەکانی هەردوو پێی لە پەنجەکانیەوە لەگەڵ ئاوەکەِ هەڵدەوەرێتە خوارەوە، پاشان سەری مەسح دەکات تا تاوانەکانی سەری لە لێواری قژیەوە لەگەڵ ئاوەکەدا هەڵدەوەرێتە خوارەوە، جا ئەگەر هەستاو نوێژی کردو

---

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

سوپاس و ستایشی خوای کردو، بەجۆرێك تاریفی کرد کە شایەنی ئەوبێت و، دڵی بە تاڵ و خاڵی کردەوە بۆ خوا، ئەوا لە تاوانەکانی دەچێتە دەرەوەو پاك دەبێتەوە هەروەك ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووە".[1]

## ئایا دەکرێت بێ هەڵە بین؟

ئەبو ئەیوب (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

-"ئەگەر ئێوە هەرگیز هیچ هەڵەیەکتان نەکردایە، ئەوا خوای گەورە ئێوەی لەناو دەبردو کەسانێکی دیکەی بەدیدەهینا کە هەڵەبکەن (بەڵام بۆ ئەوەی دواتر داوای لێ خۆش بوون بکەن) و ئەویش لێیان خۆشبێت".[2]

بە پێی ڕیوایەتێکی موسلیم ئەبو هرەیرە: دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ئێوە هیچ هەڵەیەکتان نەکردایە، ئەوا خوای گەورە هەمووتانی لەناودەبرد،

---

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

پاشان کەسانێکی دیکەی بەدیدەهێنا کە هەڵەبکەن و پاشان داوای لێخۆش بوون بکەن و ئەویش لێیان خۆش دەبوو".[1]

## پەروەردگار چۆن لە بەندەکانی خۆش دەبێت؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ لە فەرموودەیەکی قودسیدا پێی فەرمووین:

بەندەیەك گوناهێکی ئەنجامداو پاشان وتی: "پەروەردگارم لە گوناهەکانم خۆش بە!".

خوای گەورەش دەفەرمووێت:"بەندەکەم گوناهێکی ئەنجامدا لەدوای گوناهەکەی زانی کە خوایەکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و لەسەر گوناه سزا دەدات".

پاشان گوناهێکی دیکەی کردو وتی:"ئەی پەروەردگارم لە گوناهەکەم خۆش بە!".

خوای پەروەردگاریش فەرمووی:"بەندەکەم گوناهێکی ئەنجامداو پاشان زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و لەسەر گوناهیش سزا دەدات".

---

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

پاشـان ئـەو بەندەیـە گونـاهێکی دیکـەی کـردەوەو هەمدیسـان وتی:"پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆش بە!".

خـــوای پـــەروەردگاریش فـــەرمووی:" بەندەکـــەم گونـــاهێکی ئەنجامداو پاشان زانی کـە پـەروەردگارێکی هەیـە لـە گونـاه خـۆش دەبێت و لەسەر گوناه سزا دەدات. چیت دەوێت بیکە، ئەوا من لێت خۆش بووم!".[1]

باشـترینی هـەموو کردەوەکـان ئەوەیـە کـە لەبـەر خوای گەورە کەسێکت خۆش بووێت و لەبەر خـوای گەورەش ڕقت لە کەسێك بێت.[2]

## ئایا پەروەردگار لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبێت؟

ئوم دەرداء (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: گـوێم لـە ئـەبو دەرداء بـوو (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەیگـوت: گـوێم لـە پێغەمبـەری خوابووﷺ دەیفەرموو:

---

١- هەردوو پێشەوا موسلیم و بوخاری ڕیوایەتیان کردوە.

٢- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

-"خـوای گـەورە لەهـەموو تاوانـەکان خـۆش دەبێـت، جگـە لـە کەسێك کە هاوەڵ بـۆ خـوا پەیـدابکات و کەسـێکیش موسـوڵمان بـە ناهەق بکوژێت".[1]

## باشترین کردەوە لای پەروەردگار چیە؟

لـە ئـەبو سـەعیدی خودرییـەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) پێمـان گەیشتووە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"هەرکەسێك لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە یەك پلە بـێ فیـزی نیشان بدات، ئەوا خوای گـەورە لـە پاداشـتی ئـەو کارەیـدا پلەیـەك بەرزی دەکاتـەوە. هەرکەسـێکیش لـە دژی خـوای گـەورە یـەك پلـە کیبرو لووتبەرزی نیشان بدات، ئەوا خوای گەورە لـە تۆڵـەی ئـەوەدا پلەیـەك نزمـی دەکاتـەوە، تـا لـە کۆتاییـدا دەیخاتـە ژێـر هـەموو نزمیەکانەوە".[2]

خـوای پـەروەردگار خـۆی جوانـە، جوانییشـی خـۆش دەوێـت، خۆبەگـەورەزانین و لووتبـەرزیش ڕق لێبـوونی حـەق و سـووك تەماشاکردنی خەڵکە.

---

١- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردوە.

-"هەرکەسێك لەبەر خـوای گـەورە بـێ فیـز بێـت خـوای گـەورە بەرزی دەکاتەوە. هەرکەسێکیش خۆی بـەزل بزانێـت خـوای گـەورە نزمی دەکاتەوە. وە هەرکەسێك زۆر یادی خوای گەورە بکـات ئـەوا خوای گەورەش خۆشی دەوێت".[1]

## پاداشتی گریان
## لەترسی خوای گەورە چیە؟

عەبدوڵڵای کـوڕی مەسـعود (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"هـیچ موسـوڵمانێك نیـە کـە ئەگـەر تەنانـەت بەقـەدەر سـەرە مێشێکیش بێت لەترسی خوای گەورە فرمێسـك لـە چـاوەکانی بێتـە دەرەوەو فرمێسکەکانی تا سەر ڕوومەتەکانی بێتە خوارەوەو خـوای گەورە (هەتا هەتایە) ئاگری دۆزەخی لێ حەرام نەکات!".

---

١- ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردوە.

# ئایا کردەوەکان مرۆڤ ڕزگار دەکەن؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"ئەی باوەڕداران! پەرستش و کردەوەکانتان بە میانەڕەوی ئەنجام بدەن، لە زیادەڕۆیی بەدووربن. چونکە هیچ یەك لە ئێوە بە کردەوەکانتان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارتان نابێت!".

هاوەڵان لێیان پرسی:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئایا تەنانەت تۆش کردەوەکانت ڕزگارت ناکەن؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"تەنانەت منیش! ئەگەر خوای گەورە بە سۆزو بەزەیی و فەزڵی خۆی لە تاوانەکانم خۆش نەبێت، منیش کردەوەکانم ڕزگارم ناکەن!".[1]

ئەو کەسە ئازا نییە کە پاڵەوانی چاکەو، کەس لە زۆرانبازیدا دەرەقەتی نایەت، بەڵکو ئەو کەسە ئازایە کە لەکاتی تووڕەییدا خۆی پێ دەگیرێت و ڕقی خۆی دەخواتەوە.

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

## گرنگی هاوڕێیەتی چیە؟

ئیبن عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"ئەگەر مرۆڤەکان بەڕادەی من بیانزانیایە مەترسیی تەنهایی چەنێکە، هیچ سوارچاکێك بەتاقی تەنیا بەشەو ڕێی نەدەگرتەبەر".[1]

سەعیدی کوڕی موسەییەب (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"شەیتان ئازاری ئەو کەسانە دەدات کە بە تەنهان یاخود دوو کەس بە تەنها بەیەکەوەن. ئەگەر سێ کەس بن، شەیتان ناتوانێت زیانیان پێ بگەیەنێت".[2]

## باشترینی مرۆڤەکان کێن؟

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

- " باشترین مرۆڤ ئەو کەسانەن کەلەسەردەمی مندا ژیاون. پاشان ئەوانەی دوای ئەوان. پاشان ئەوانەی دواتر".

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا مالك لە (موطأ) ڕیوایەتی کردوە.

عیمـران (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت:"نـازانم دوای سـەردەمی خـۆی دوو سـەردەمی وت یـان سـێ سـەردەم. لـەدوای ئـەم دوایـین کۆمەڵەیەدا جۆرە مرۆڤێك دێن کە شایەتی دەدەن بێ ئـەوەی داوای شایەتیان لێ بکرێت، ئەوان لەنێو ناپاکیدان، متمانەیان پێ ناکرێـت. پەیمان دەدەن و نایبەنە سـەر. لەناویانـدا قەڵـەوی دەبێتـە دیـاردە (دەردەکەوێت)".

لەڕیوایەتێکی دیکەشدا ئەمەش بۆ فەرموودەکە زیادکراوە:

-"بـێ ئـەوەی داوای سـوێند خواردنیـان لێ بکرێـت سـوێند دەخۆن".[1]

ئـەبو موسـا (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: "لەگـەڵ پێغەمبـەری خـواداﷺ پێکـەوە نوێـژی ئێوارەمـان دەکـرد. لـەناو خۆماندا وتمـان:"بـا لێـرە بمێنینـەوەو نوێـژی (عیشـاء)یـش لەگـەڵ ئـەودا بکـەین". ماینـەوەو دانیشـتین. کـە وامـان وت پێغەمبـەرﷺ هاتەلامان فەرمووی:"ئەوە هێشتا لێرەن؟".

وتمان:"بەڵێ!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "کارێکی باشتان کرد!".

پاشان سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو فەرمووی:

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

-"ئەستێرەکانن هێمنی و ئاسایشی ئاسمان، کاتێك ئەستێرەکان دیارنامێنن، ئەو شتەی پەیمان درابوو دێت بۆ ئاسمان. منیش هێمنی و ئاسایشی هاوەڵەکانم، کاتێك من ڕۆشتم ئەو شتەی پەیمان دراوە دێت بۆ هاوەڵەکانم. هاوەڵەکانیش هێمنی و ئاسایشن بۆ ئوممەتەکەم، کاتێك هاوەڵەکانیش دەڕۆن ئەو شتەی پەیمان دراوە دێت بۆ ئوممەتەکەم".[1]

## تایبەتمەندیەکانی باوەڕدار چین؟

صەفوانی کوڕی سولەیم (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: وتمان: "ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا دەکرێت کەسی باوەڕدار ترسنۆك بێت؟"

فەرمووی: "بەڵێ!"

وتمان: "ئەی دەکرێت ڕەزیل و چروك بێت؟"

دیسان فەرمووی: "بەڵێ!"

ئێمەش دیسان وتمان: "باشە! ئەی دەکرێت درۆزن بێت؟"

ئەمجارە فەرمووی: "نەخێر!".[2]

---

١- پێشەوا موسلیم لە باسی فەضلی هاوەڵان ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا مالك لە (موطأ) ڕیوایەتی کردوە.

# پەسەندترین مرۆڤ
# لای خوای گەورە کێیە؟

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە:

ڕۆژێك پرسیار لە پێغەمبەری خواﷺ کرا:

-"باشترین مرۆڤ کێیە؟"

ئەویش فەرمووی: "هەرکەسێکە کە دڵی پاك بێت، ڕاستگۆ بێت".

هاوەڵەکان (ڕەزای خوایان لێبێت) وتیان:"ئێمە دەزانین یەکێك وتە ڕاست بێت، واتای چیە! بەڵام نازانین دڵ پاك بێت واتای چیە؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "دڵی پاك ئەو دڵەیە کە لەخوای گەورە دەترسێت و دڵێکی پاك و تەمیزە، لەناویدا هیچ تاوان و زوڵم و ڕق و کینەو حەسوودی و بەخیلی نیە!"

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خوایانﷺ پرسی:"ئەی پێغەمبەری خوا! باشترین موسوڵمان کامەیە؟".

وەڵامی دایەوەو فەرمووی: "ئەو موسوڵمانەیە کە موسوڵمانان لە دەست و زمانی سەلامەت بن".

ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خوایﷺ پێی فەرمووم:

-"ئەی ئەبو هورەیرە، خاوەن وەرع (سڵەمینەوە)بە و (لەو شتە گوماناویانە دووربکەوەرەوە کە تووشـی تاوانـت دەکـەن) تـا ببیتـە باشترین بەندەی خوای گەورە! بە قەناعەتی بکەرە بنەما بۆ خۆت، تا ببیتە سوپاسگوزارترین بەندەی خوای گەورە لـەنێو مرۆڤەکانـدا. هەرشتێك بۆ خۆت پێت خۆش بوو بۆ کەسانی دیکـەش پێـت خـۆش بێت، تا ببیتە باوەڕدارێکی تەواو.

ببە بە دراوسێیەکی باش بۆ ئـەو کەسانەی کـە دراوسـێیەتی تـۆ دەکـەن تـا ببیتــە موسـوڵمانێکی تــەواو. کـەم پێبکەنــە چـونکە پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێت".

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خـوایﷺ فەرموویـەتی:"مـن وشـەیەك (عوسمـان دەڵێـت: ئایـەتێك) دەزانم. ئەگەر مرۆڤەکان هەموویان وابەستەی بن، ئەوا ئەوەیان بەسە!".

هاوەڵەکان (ڕەزای خوایان لێبێت) وتیان:"ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە کام ئایەتەیە؟".

پێغەمبـەرﷺ ئـەم ئایەتــە پـیرۆزەی خوێنــدەوە: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ ....﴾ الطلاق: ٢ – ٣.

واتە: هەرکەسیش لە خوا بترسێ خوا کەلێنێکی بۆ ئەکاتەوە ڕزگاری ببێ پێی لە تەنگوچەڵەمە. ڕۆزیشی لەلایەکەوە بۆ ئەنێرێ خۆی گومانی نەبردبێ.

## ئایا بەدبەختی هەیە؟

عوروەی کوڕی عامری قوڕەیشی (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا باس لە بەدبەختی و بێشانسی کرا، ئەویش فەرمووی:

- "ئەمە جۆرێکە لە هەڵخەڵەتاندن (بەختگرتنەوە)یە. با (باوەڕبوون بە شانس و بەخت) نەبێتە کۆسپ لەڕێی موسوڵمانانندا. ئەگەر هەریەکێك لە ئێوە شتێکی بینی کە پێی خۆش نەبوو با ئەم نزایە بخوێنێتەوە:

"اللّهُمَ لا يأتي بِالحَسَنةِ إلاّ أنت ولا يَدْفَعُ السّيئةُ إلا أنت ولا حَول ولا قوةَ إلا بِكَ."

واتە: پەروەردگارم جگە لەتۆ کەس خێرو چاکە نابەخشێت و جگە لەتۆش هیچ کەس ناتوانێت لەخراپە بمانپارێزێت. هەموو هێزو توانایەکیشمان (کە بۆ پەرستش، بۆ کارکردن و هەوڵدان، خۆپاراستن پێویستمانە) هەر لەلایەن تۆوەیە".[1]

---

١- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

ئیبن مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"بەخت گرتنەوە هاوەڵ دانانە بۆ خوای گەورە، بەخت گرتنەوە هاوەڵ دانانە بۆ خوای گەورە، بەخت گرتنەوە هاوەڵ دانانە بۆ خوای گەورە.[1] (جگە لەو کەسەی وەهمی بێشانسی دێ بە دڵە بێدەسەڵاتەکەیداو لەناخی دڵیدا ڕقی لە هەندێ شتە) لەناو ئێمەدا شتی وا نییە. بەڵام خوای گەورە ئەم گومانەش بە بە پشت بەستن و تەوەکول دەڕەوێنێتەوە."

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"تەنینەوەی نەخۆشی نییە، شوومی و ڕەشبینی بوونی نییە. من (فأل)م پێ خۆشە.

لێیان پرسی: "(فأل) چیە؟".

فەرمووی: "وتەیەکی جوانە!".

## پێوەر چییە لە چاکە و خراپەدا؟

ئەبو طوفەیل (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك پارەیەکی حەرام پەیدا بکات و

---

١- هەردوو پێشەوا ئەبوداود و ترمزی ڕیوایەتیان کردوە.

بەوپارەیە کۆیلە ئازاد بکات و یارمەتی خزم و ناسیاوەکانی بدات، ئەوا ئەوە بۆی دەبێتە گوناه (تاوان)".[1]

لەمەیمونەی کچی سەعدەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە کە وتویەتی:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ ! دەربارەی پارەی دزراوە فەتوایان بەریٚ!"

ئەویشﷺ فەرمووی: "هەکەسێك کە ئەو پارەیە بخوات و بشزانێت ئەو پارەیە دزراوە، ئەوا ئەویش لە تاوانی دزینەکەدا بەشدار دەبێت".[2]

لە ئەبو بەکرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "جەستەیەك بە حەرام بەخێو کرابێت، ئەوا ناتوانێت بچێتە بەهەشتەوە".

لە ڕیوایەتێکی ئەبو یەعلی (لە کتێبی معجم الأوصاف) دا کە لە حوزەیفەوە پێی گەیشتووە، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "هەر گۆشتێك بە حەرام بەخێوکرابێت و پێگەیشتبێت ئەوا ناتوانێت بچێتە بەهەشتەوە؛ دۆزەخ گونجاوترە".[3]

---

١- طەبەرانی ڕیوایەتی کردوە.

٢- طەبەرانی ڕیوایەتی کردوە.

٣- لە (جمع الفوائد)دا هاتووە.

پێغەمبەری خوا لە وەڵامێکدا کە سەبارەت بە پێوەری چاکەو خراپە لێی کرا بوو. ئاماژەی بەوە کرد کە خودی ویژدان پێوەرەو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ویژدان باشترین پێوەرە بۆ ناسینەوەی چاکەو خراپە.

لە (وابسە) وە (ڕەزا ی خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە: ئەو هاتبووە خزمەت پێغەمبەرﷺ چونکە هاتبوو بەمێشکیدا کە پرسیاری دەربارەی چاکەو خراپە لێ بکات.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "تۆ دەیڵێیت یان من پێت بڵێم؟".

ئەویش وتی: "تۆ بەمن بڵێ!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "تۆ هاتویت تا لێم بپرسی چاکەو خراپە چیە، وانیە؟"

وتی: " بەڵێ!".

پێغەمبەرﷺ سێ پەنجەی خۆی لەیەك لادا کۆکردەوەو خستیە سەر سینەم و فەرمووی: "بەڵێ ئەی وابیسە، لە نەفسی خۆت بپرسە، لە نەفسی خۆت بپرسە! (سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە) چاکە ئەو شتەیە کەدڵت پێی ئارام دەبێت. خراپەش ئەو شتەیە ئەگەر تەنانەت خەڵکیش فەتوات بدەنێ لەسەری، ئەوا هەر دڵت پێی ئارام نابێت و دوو دڵی لە ناختدا دەبیستیت!".[1]

---

١- لە (جمع الفوائد)دا هاتووە.

# نیشانەکانی مرۆڤی خراپ چین؟

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموویێت:

-"چوار خەسڵەت هەن، هەرکەسێك ئەم چوار خەسڵەتەی تێدا ببینرێت ئەوا دووڕوویەکی تەواوە. هەرکەسێکیش یەکێك لەم خەسڵەتانەی تێدا ببینرێت ئەوا تا ئەوکاتەی دەستبەرداری ئەو خەسڵەتە دەبێت یەکێك لە خەسڵەتەکانی دووڕووی تێدایە: کاتێك متمانەی پێ دەکرێت خیانەت لەو متمانەیە دەکات، کاتێ قسەی کرد درۆدەکات، کاتێك پەیمان دەدات پەیمانەکەی ناباتە سەرو، کە دوژمنایەتی دەکات لە سنوور دەردەچێت".

ڕۆژێکی وادێت کە مرۆڤ گوێ ناداتە ئەوەی ئایا ئەو شتەی بەدەستی هێناوە، بە حەڵاڵی بەدەستی هێناوە یان بەحەرامی.[1]

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

## ئایا دەبێت خەمی ڕزق و ڕۆزیمان بێت؟

کوڕەکـانی خالیـد(حَبَّـة) و (سَـو) (ڕەزای خوایـان لێبێـت) دەگێڕنـەوە: "کاتێـك پێغەمبـەری خـوای ﷺ خـەریکی چاککردنەوەی شتێك بوو چوینە خزمـەتی. لـەو کارەدا یارمەتیمانـدا. پێغەمبـەری خوای ﷺ فەرمووی: "تا سەرتان لە جوڵەدا بێت هـەرگیز لـەبارەی ڕزق و ڕۆزییـەوە نەکەونـە نائومێدییـەوە. چـونکە مـرۆڤ کاتێـك لـەدایك دەبێت ڕووت و ڕەجاڵە (هیچی پێـوە نییـە لـە جل و بـەرگ) نییـە، بەڵام دوایی خوای گەورەو میهرەبـان بەچـەندین ڕزق و ڕۆزی جـۆراو جۆر ڕزقی دەدات".

عـەمری کـوڕی عـاص (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموویەتی: "گومان لەوەدا نییە کە لـە هـەموو دۆڵێکدا پارچەیەك لە دڵی مرۆڤ هەیە (واتە دڵ بە هەموو شتێکەوە: پەیوەست دەبێت). کەواتە هەرکەسێك دڵی پەیوەست بێت بەهەموو پارچەکانەوە، ئەوا خوای گەورە گـوێی پێنـادات لـە چ دۆڵێکدا تیـا دەچێت. هەرکەسێکیش پشت بەخوای گەورە ببەستێت ئـەوا خـوای بەسە بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لەوەی دڵـی وابەسـتەی هـەموو شـتێك ببێت و پەرتەوازە ببێت و بفەوتێ".

## تایبەتمەندی(ماهیەت) تەوبە چیە؟

حارسی کوڕی سوەید (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دوو وتەی بۆ گێڕاینەوە. یەکێکیان فەرموودەی پێغەمبەری خوابووﷺ ، ئەوی تریشیان وتەی خۆی بوو، عەبدوڵڵا وتی:"موسوڵمان تاوانەکانی بەم شێوەیە دەبینێت:"ئەو وا هەست دەکات کە لەسەر لوتکەی شاخێکە، کە هەموو ساتێك مەترسی ئەوەی هەیە دارمێت، بەترس و لەرزەوە وەستاوەو دەترسێت شاخەکە دارمێت. بەڵام مرۆڤی بێباوەڕ تاوانەکەی وەك مێشێك دەبینێت کە بەسەر لوتیدا تێدەپەڕێت".

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دوای قسەکانی بەدەستی هێمای کردو وتی:"بەم شێوەیە ! "، هەروەك بڵێی مێشێك لەسەر لوتی لادەدات.

پاشان وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوابووﷺ فەرمووی:"خوای گەورە تەوبەی بەندەکانی هەروەك ئەم کابرایە پێ خۆشە: پیاوێك لە بیابانێکی بێ ڕووەك و چۆڵ و مەترسیداردا لەگەڵ سوارەکەیدا کە هەموو خواردن و خواردنەوەکەی لەسەر دانابوو بەڕێ کەوتبوون. پاش ماوەیەك لە هیلاکیدا سەری دادەنێت و دەخەوێت. کاتێك خەبەری دەبێتەوە دەبینێت ئاژەڵەکەی سەری خۆی هەڵگرتووەو ڕۆیشتووە. بەهەموو لایەکدا بۆی دەگەڕێت بەڵام بێ

هودەیە. لە کۆتاییدا بە برسێتی و بێئاوی و هیلاکی دەڵێت: با بگەڕێمەوە بۆ هەمان ئەو شوێنەی ئاژەڵەکەمی لێ ون بوو. تا ئەو کاتەی دەمرم لەوێدا بخەوم! دێت و لەوێدا سەری لەسەر قۆڵی دادەنێت و کەمێك دەخەوێت. کاتێك خەبەری دەبێتەوە دەبینێت ئاژەڵەکەی بەسەر سەریەوەیەتی و هەموو خواردن و خواردنەوەکانیشی لەسەرە. پێ خۆش بوونی خوای گەورە بۆ تەوبەی بەندەکانی زیاترە لە دڵخۆشی ئەو پیاوە بۆ گەڕاندنەوەی سوارەکەی بەخواردنەکەیەوە".[1]

جنێو مەدەن بە گەورەو سەرکردەکانتان. بەڵکو دوعایان بۆ بکەن تا بەرەو باشی برۆن. چونکە باشی ئەوان ئەوە دەگەیەنێت کە ئێوە باشن.[2] أبو أمامة، طبراني.

## ئایا لە تەوبەکردندا سنوور هەیە؟

ئەبو سەعید (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"لەناو ئەو نەتەوانەی کە پێش ئێوە ژیاون پیاوێك هەبو نەوەدو نۆ کەسی کوشتبوو. جارێکیان لە زاناترین کەسی سەر زەوی پرسیاری کرد، پێی ڕاگەیاند کە تا هاتووەتە لای

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

٢- ئەبو ئومامەو طەبەرانی ڕیوایەتیان کردوە.

ئەو نەوەدو نۆ کەسی کوشتووەو ئایا دەکرێت تەوبە بکات یان نا.
ڕاهیبەکە پێی وت: کە ناتوانێت تەوبە بکات! پیاوەکە ڕاهیبەکەیشی کوشت و تاوانەکەی بوو بە سەد دانەی تەواو.

ئەو پیاوە فەقیرە بەردەوام بوو لەوەی لەزاناترین کەسی سەرزەوی بپرسێت. زاناترین پیاویان بۆ هەڵدا. ئەویش چووە لای و پێی وت: تا ئێستا سەد کەسم کوشتووە ئایا دەتوانم تەوبە بکەم یان نا؟ زاناکە پێی وت:"بەڵێ! دەتوانیت تەوبە بکەیت. کێ دەتوانێت ببێت بە ڕێگر لەنێوان تۆو تەوبەکردنتدا؟"

بەردەوامی بە قسەکانیداو وتی:"بەڵام، پێویستە بچیت بۆ فڵانە مەملەکەت. چونکە لەوێ کەسانێکی لێیە کە خوای گەورە دەپەرستن. تۆش لەگەڵ ئەواندا خوای گەورە بپەرستەو هەرگیز جارێکی دیکە مەگەڕێرەوە بۆ مەملەکەتەی خۆت. چونکە ئەوێ شوێنێکی خراپە".

پیاوەکە کەوتەڕێ. کاتێك دەڕۆیشت لەنیوەی ڕێگەدا بوو و نەدەبوو، فریشتەی گیان کێشان هات و گیانی کێشا. فریشتەکانی ڕەحمەت و فریشتەکانی عەزاب دەربارەی کەوتنە ناکۆکی. فریشتەکانی ڕەحمەت دەیانوت:"ئەو پیاوە وەك تەوبەکارێك هاتووە، لەناخی دڵیەوە گەڕاوەتەوە بۆلای خوای گەورە".

فریشتەکانی عەزاب دەیانوت:"ئەم پیاوە هیچ کارێکی چاکەی ئەنجام نەداوە".

کاتێك ئەوان لە مشتومڕی ئەوەدا بوون، فریشتەیەکی دیکە لەشێوەی مرۆڤدا هاتە لایان. فریشتەکان ئەویان کردە ناوبژیوان لەنێوان خۆیاندا. ئەویش پێی وتن:"ماوەی نێوان ئەو شوێنەی لێی دەرچووە تا ئەو شوێنەی بۆی دەچوو بیپێون، لەکام لایەوە نزیکتر بوو ئەوا تەسلیمی ئەوەی بکەن".

کاتێك پێوایان، بینیان لەو شوێنەوەی بۆی دەچوو (کە مرۆڤە باشەکانی لێ بوو) بستێك نزیکترە. ئیتر یەکسەر فریشتەکانی ڕەحمەت پیاوەکەیان برد.

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەمەش زیادکراوە:"دوای کەمێك لە بەڕێ کەوتنەکەی مردن هات و ڕووبەڕووی بوویەوە. پیاوەکە ڕووی بەرەو ئەو دێیە وەرگێڕا کە مرۆڤە ساڵحەکانی لێ بوو. بەم شێوەیە بەیەکێك لە دانیشتوانی ئەو دێیە ژمێردرا".[١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"تەنانەت ئەگەر تاوانەکانتان (ئەوەندە زۆر بێت) بگاتە ئاسمان، ئەگەر بەدوایدا تەوبە بکەن، ئەوا بێگومان خوای گەورە لێتان خۆش دەبێت".

١ – هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

## چۆن سوپاسگوزار بین بەرامبەر
## ئەو کەسەی چاکەمان لەگەڵدا دەکات؟

جابر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "هەرکەسێك چاکەیەکی بەرامبەر کرا ئەوا با بەو ڕاددەیەی کە هەیەتی دەست بەجێ پاداشتەکەی بداتەوە؛ ئەگەر نەشی بوو ئەوا با ستایشی ئەو کەسە بکات کە چاکەکەی بەرامبەر کردووە. چونکە بەو ستایش کردنەی واتا سوپاسگوزار بووە. ئەگەر کەسێك بەرامبەری ئەو کەسەی چاکەی بەرامبەر کردووە سوپاسگوزار نەبێت یاخود پاداشتەکەی نەداتەوە ئەوا بێ ئەمەکە".[1]

## بۆچی لە ئاینی ئێمەدا سوپاس کردن گرنگە؟

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: کاتێك موهاجیرەکان لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە (ئەو یارمەتیانەی ئەنسارەکانیان بینی) وتیان:

-"ئەی پێغەمبەری خواﷺ ! ئێمە هیچ قەومێکمان نەدیوە چوبێتینە ناویان وەك ئەم مەدینەییانە! ئەوانەی سامان و موڵکدارن

---

١- (أبو طود)، لە کتێبی (أدب)دا باسی کردوە..

بەجۆرێك سەخی و بەخشندەن و ئەوانەش سامانیان کەمە بەجۆرێك بەجوانی یارمەتیان داوین کە شتی وامان نەبینیوە. ئەوان لەجیاتی ئێمە کارەکانمانیان ئەنجام داوە، یارمەتیان داوین بۆ جوان رێکخستنی ژیانمان. ئێمە خەمی ئەوەمانە کە پاداشتەکانمان (بە کۆچ کردن و خواپەرستی) هەمووی ئەوان ببەن!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "نەخێر! ئەوانە تەنها پاداشتی ئەوە بەدەست دەهێنن کە بەهۆی دوعاو سوپاسگوزاری ئێوەوە پێیان دەگات".[1]

## پێویستە سنووری بیرکردنەوەمان لە زات و زانستی خوای گەورە چی بێت؟

ئەبو سەعلەبە ئەلجوشەنی (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"خوای گەورە کۆمەڵێك فەرزی بۆ داناون، ئێوە لێیان کەم مەکەنەوە. کۆمەڵێك سنووریشی داناوە. لێیان لامەدەن. هەندێ شتی حەرام کردووە، ئێوە نزیکی مەکەونەوە. هەندێ شتیشی (بە بێ فەرزکردن، حەرام کردن یان سنووردانان) جێهێشتووە. بەهۆی بیرچوونەوە ئەمانەی

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

جێنەهێشتووە. کەواتە لەمانە (ئایا حەرامە یان فەرزە) مەکۆڵنەوە".

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "کاتێك خەڵك پرسیارتان لێ دەکەن دەربارەی زانست بەردەوام دەبن تا دەگەنە ئەوەی بڵێن: "تێگەیشتین، کە خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێکە. باشە، ئەی بەدیهێنەری ئەو کێیە؟" ئەمە وەسوەسەی شەیتانە. بوونی خوای گەورە لە خودی خۆیەوەیە. ئەو، ئەزەلی و ئەبەدییە.[١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەستی پیاوێکی گرت و بەردەوامی بە قسەکانیدا: "خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە. دووکەس ئەم پرسیارەی لەمن کردووە؛ ئەم پیاوەش سێیەمیانە".

## ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری خواﷺ چیە دەربارەی ئەوەی کە پێویستە پێشنوێژ نوێژەکانیان کورت بێت؟

ئەبو مەسعود عوقبەی کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: یەکێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ پێی وت: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فلانە کەس کاتێك پێش نوێژیمان بۆ

---

١– هەردوو پێشەوا بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

دەكات، ئەوەندە نوێژەكە درێـژ دەكاتـەوە خەریكـە وام لێـدێت واز لەنوێژەكانم بهێنم".

هـــەرگیز پێغەمبـــەری خـــوامﷺ وەك ئـــەو ڕۆژە بـــەتووڕەیی نەبینیبوو. فەرمووی:"ئەی خەڵكینە، خەسڵەتی لەبەرچاوخستنمان تێدایـە. هەریـەكێك لـەئێوە پـێش نوێـژی بـۆ خـەڵك دەكـات، بـا بـە ئاسانی بیكات. چونكە لەناو جەماعەتەكەدا خەڵكی نەخۆش و لاوازو ئەرك قورسی تێدایە".[١]

## پێویستە پەیوەندی نێوان موسوڵمانان چۆن بێت؟

ئەبو هـورەیره (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرگیز ڕێگە مەدەن بە گومان. چونكە گومان بـردن درۆتـرین قســەیە. سـیخوڕی مەكـەن، هـەواڵ بڵاومەكەنـەوە، چاودێری یەكتر مەكەن، حەسودی بەیەكتر مەبـەن، بـوغزو كینـەتان نەبێت بەرامبەر یەكتر، پشت لەیەكتر مەكەن، ئەی بەندەكانی خـوا، ببنـە بـرای یـەكتر بـەو شـێوەیەی كـە خـوای گـەورە فـەرمانی پـێ كردوون".

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی كردوە.

-"موسوڵمان برای موسوڵمانە. (سوکایەتی) پێ ناکات، ستەمی لێ ناکات، بێ بەشی ناکات، ڕقی لێی نابێت".

-"ئەگەر کەسێك لە دووی شەڕ ئەگەڕێت، ئەوا ئەوەندەی بەسە کە سوکایەتی بە برا موسوڵمانەکەی بکات. ماڵ و خوێن و ناموسی هەر موسوڵمانێك حەرامە لەسەر موسوڵمانێکی دیکە".

-"خوای گەورە سەیری ڕووخسارو جەستەی ئێوە ناکات، بەڵام سەیری دڵەکانتان و کردەوەکانتان دەکات. تەقواو لەخوا ترسی لێرەدایە. -بەدەستی ئیشارەتی بۆ سینەی کرد-".

-"هەرگیز نەکەن بەسەر فرۆشتنی یەکێکتانەوە فرۆشتن بکەن. ئەی بەندەکانی خوای گەورە ببنە برای یەکتر. زویر بوونی موسوڵمانێك لە برا موسوڵمانەکەی لە سێ ڕۆژ زیاتر حەڵاڵ نابێت!".[1]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمانێکی دیکە پێنج شتە: وەڵامدانەوەی سەلامەکەی، سەردانکردنی کاتی نەخۆشی، بەشداری کردن لە ڕێوڕەسمی جەنازەکەیدا، قبوڵ کردنی دەعوەت کردنی و، کاتێك دەپژمێت پێی بڵێت (يَرْحَمُكَ الله)".[2]

---

١- پێشەوا بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

٢- پێشەوا بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

## گرنگی سەلام کردن

## بەڕوویەکی خۆشەوە چیە؟

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"ئەی ئەبو زەڕ! هیچ کارێکی چاکە بەکەم مەزانە، تەنانەت سەلام کردنت لەگەڵ برایەکی موسوڵمانتدا بە ڕوویەکی خۆشەوە کارێکی بچووک نیە. کاتێك گۆشت دەکڕیت یاخود چێشتێك دەکوڵێنیت کەمێك ئاوەکەی زیادبکە، لەوە ئەگەر مشتێکیش بێت بەشی دراوسێکەت بدە".[١]

## لەکاتی دەست نیشانکردنی هاوسەردا

## پێویستە سەرنجی چی بدەین؟

ئازادکراوەکەی پێغەمبەری خواﷺ سەوبان (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: "کاتێك ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەی (کۆکردنەوەی) زێڕو زیو، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ التوبة: ٣٤.

واته: ئەی موسوڵمانینە! بەڕاستی گەلێ لە زانایانی ئایینی و ڕەبەنانی ئەهلی کیتاب بە ناحەق ماڵی خەڵك ئەخۆن و ڕێگا لە خەڵك ئەگرن کە ئیسلام ببن و بکەونە سەر ڕێی ڕاست . ئەوانە ئاڵتوون و زیو کۆئەکەنەوەو لە ڕێگای خودادا صەرفی ناکەن. واتە زەکاتی شەرعی لێ دەرناکەن، ئەوانە موژدەیان بدەرێ بە سزای سەختی ڕۆژی دوایی.

خەڵکەکە کەوتنە پرسیارکردن لەناو خۆیاندا کە مادام وایە، چ سامانێك کۆبکەنەوە. عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: "من ئەم پرسیارە دەکەم و وەڵامەکەیتان بۆ دەهێنمەوە". دەست بەجێ سوار وشترەکەی بوو و چووە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ لێی پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا چ سەروەتێك کۆبکەینەوە (بەدەستی بهێنین)؟" پێغەمبەری خوایشﷺ پێی فەرموو: "ببنە خاوەنی دڵێکی سوپاسگوزارو زمانێکی بە زیکرو هاوسەرێکی موسوڵمان کە یارمەتیدەرتان بێت بۆ کردەوەکانی دوارۆژتان".

بەپێی ڕیوایەتێکی ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێبێت) گێراویەتیەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "موسوڵمان، دوای تەقواو ترسی خوا، لەهەموو شتێك زیاتر خێر لە هاوسەرێکی سالح

دەبینێت. ئەو جۆرە ژنە ئەگەر هەر فەرمانێکی پێ بکرێت (لەلایەن مێردەیەکەوە) ئەوا جێبەجێی دەکات. کاتێك مێردەکەی سەیری دەکات دڵخۆش دەبێت. کاتێك سوێندێك بخوات دەربارەی ئەوەی ژنەکەی شتێك بکات یان نەیکات، ژنەکەی ئەو شتە جێبەجێ دەکات و سوێندەکەی دەپارێزێت. کاتێك لە ژنەکەی دووردەکەوێتەوەو بەجێی دەهێڵێت بۆ شوێنێکی دوور بۆ ماوەیەك، ئەوا ژنەکە ماڵ و ناموسی پیاوەکەی دەپارێزێت و بەوەفاو سەر ڕاست دەبێت".

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "لەبەر جوانی ڕووخسار ژن مەهێنن. چونکە ترسی ئەوە هەیە جوانیەکانیان بەهۆی لووت بەرزی و غرورەوە نزمیان بکاتەوە. بەهۆی ماڵ و سامانەکانیانەوە مەیانهێنن، چونکە ڕەنگە ئەو ماڵ و سامانەیان لە تەفرەیان بدات. تەنها دین وئیمان بکەنە بنەما کاتێك هاوسەرگیری دەکەن. سوێند بەخوا، ژنێکی کۆیلەی ڕەشی ئیماندار کە گوێی بڕابێت و لوتی بڕابێت باشترە لە ژنێکی ئازادی بێ دین".

## ئایا لە ئایینی ئێمەدا باوك دەتوانێت كچەكەی بە زۆر بەشوو بدات؟

ئیبن بورەیدە (ڕەزای خوای لێبێت)، لە بورەیدەی باوكیەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: كچێكی لاو هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ پێی وت: باوكم بۆئەوەی بچووكی و سەرشۆڕییەكەی بە من پینە بكات منی دا بە ئامۆزاكەم.

بورەیدە دەڵێت:"پێغەمبەری خواﷺ دەسەڵاتی (ڕەت كردنەوە یان پەسەندكردنی) بۆ كچەكەی بە جێهێشت. كچەكەش وتی:"من قایلم بەوەی كە باوكم كردوویەتی بەڵام تەنها ویستم ئەوە بۆ ئافرەتان ڕوون بێتەوە كە باوكەكانیان مافی ئەوەیان نیە بەزۆر بیاندەن بە شوو".

## پێویستە ژن و مێرد بە چ شێوازێك مامەڵە لەگەڵ یەكتر بكەن؟

ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"باشترینتان ئەو كەسەیە كە بە باشترین شێوە لەگەڵ خێزانەكەیدا مامەڵە دەكات، من لە هەمووتان باشترم بۆ خێزانەكەم".

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "باشترین کەس لەناو ئێوەدا، ئەو کەسەیە کە بە باشترین شێوە مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەکات".

## پاداشتی سەردانکردنی خێزان و سیلەی ڕەحم چیە؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"هەرکەسێك دەیەوێت ڕزقی لەلایەن خوای گەورەوە زیادبکات و تەمەنی درێژ بێت ئەوا با سەردانی خزم و کەسوکاری بکات".

لە ڕیوایەتێکی ترمذیدا بەم شێوازە هاتوە: "لە نەسەبتانەوە فێری بەجێگەیاندنی سیلەی ڕەحم ببن، چونکە سیلەی ڕەحم دەبێتە هۆی خۆشەویستی لەنێوان خزمانداو زۆربوونی ماڵ و سامان و تەمەن درێژی".

## پێویستە کێ پێش بخرێت بۆ پێدانی یارمەتی و کۆمەك؟

سەلمانی کوڕی عامر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"ئەو خێرو صەدەقەیەی دەدرێت

به هەژارێك ئەوا خێرێکە، بەڵام ئەو صەدەقەیەی دەدرێت بە خزمێك دوو خێرە: یەکێکیان سیلەی ڕەحمەو ئەوی تریان صەدەقەیە".[1]

دوو خەسڵەت هەن، هەگیز لە باوەڕدارێکدا کۆنابنەوە: چرووکی و بەدڕەوشتی.[2]

## تێڕوانینی پێغەمبەرمانﷺ بەرامبەر بە دوژمنەکانی چۆن بوو؟

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ کە خەڵکی مەککە بوو، بەهۆی ئەوەی هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامی دەدا، لە نیشتمانەکەی خۆی دەرکرا. کافرەکان تەنها بەمەش قایل دەبوون بەڵکو زیانیان بە گیانی گەیاندو چەندین ئەشکەنجەی باوەڕپێنەکراویاندا.

کاتێك بە زۆر پێغەمبەریانﷺ لە مەککە دوورخستەوەو ناچاریان کرد کۆچ بکات بۆ مەدینە، دوای ئەوەی چووە مەدینەش جەنگیان دژی بەرپا کرد. ئەو بەرامبەر ئەو دوژمنە مەککەییانەی کە سنووریان نەبوو بۆ دوژمنایەتەکانیان بەردەوام بە تێڕوانینی

---

١- نەسائی و ترمزی و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردوە.

٢- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

مرۆڤانە بیری دەکردەوە. چونکە پێغەمبەری خواﷺ ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهان.

کاتێك پێغەمبەری خواﷺ هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە خەڵکی مەککە بەدەست وشکە ساڵی و قات و قڕی نەدارییەوە دەناڵێنن، بە عەمری کوڕی ئومەییەدا ئاڵتون و تۆوی خورما و جۆی نارد بۆ مەککە و فەرمانی کرد کە ئەوانە تەسلیم بکرێن بە ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و صەفوانی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف و سوهەیلی کوڕی عەمر، سوهەیل و صەفوان خۆیان دزیەوە لە وەرگرتنی ئەم شتانە، بەڵام ئەبو سوفیان هەموو ئەو شتانەی وەرگرت و بەسەر هەژارانی قورەیشدا دابەشی کردو سوپاسگوزاری خۆی نیشانداو وتی:

-"خوا برازاکەم بۆ کاری خێرو چاکە سەرکەوتوو بکات! چونکە ئەو حەقی خزمایەتی لەبەرچاو گرتوە!".

پێغەمبەری خواﷺ جارێکی دیکە هەر بە عەمری کوڕی ئومەییەدا خورمای عەجوەی بەدیاری بۆ ئەبو سوفیان ناردو نامەی بۆ نووسی کە لەبەرامبەر ئەمەدا پێستی مەڕی بەدیاری بۆ بنێرێت؛ ئەبو سوفیانیش ئەو پێستی مەڕەی داوای کردبوو بەدیاری بۆی نارد.

## ئایا باوەڕدار درۆ دەکات؟

صەفوانی کوڕی سولەیم (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خوامان پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا دەکرێت موسوڵمان ترسنۆك بێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "بەڵێ!".

وتمان:"باشە! ئەی دەکرێت چرووك بێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "بەڵێ!".

ئێمەش پاشان پرسیمان:"ئەی دەکرێت درۆزن بێت؟".

ئەمجارەیان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "نەخێر!".[١]

بە ئیمامی مالیك گەیشتووە، ئیبن مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) وتویەتی:"بەندە بەردەوام دەبێت لە درۆکردن و بەدواداچوونی درۆکردن، تا کاتێك دێت کە پەڵەیەکی ڕەش لەسەر دڵی دروست دەبێت. پاشان ئەم پەڵەیە وردە وردە گەورە دەبێت تا هەموو دڵی ڕەش دەبێتەوەو لە کۆتاییدا لای خوای گەورە بە درۆزن دەنووسرێت.

لەبەرئەوە ئەگەر بۆ گاڵتەش بێت نابێت درۆ لەگەڵ منداڵدا بکرێت، چونکە ئەوە زیانی هەیە بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکەو دەبێتە تاوان.

---

١- پێشەوا مالك لە (موطأ)دا ڕیوایەتی کردوە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك پێغەمبەری خواﷺ لەماڵی ئێمە دانیشتبوو کاتێك دایکم بانگی کردم و وتی: "وەرە، بزانە چیت دەدەمێ؟".

پێغەمبەری خواﷺ لە دایکمی پرسی: "دەتویست چی بدەیت بە منداڵەکە؟".

دایکم وتی: "ویستم خورمایەکی بدەمێ".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "وریابە! ئەگەر نەتەوێت هیچ شتێکی بدەیتێ ئەوا تاوانێکت لەسەر دەنوسرێت".[1]

## پلەی ڕاستگۆیی لای خوای گەورە چییە؟

ئیبن مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "ڕاستگۆیی مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگەی چاکە، کاری چاکەش مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگەی بەهەشت.

کەسی واهەیە ئەوەندە ڕاستگۆیەو ئەوەندە سۆراخی ڕاستی دەکات، تا لای خوا بەڕاستگۆ لەقەڵەم دەدرێت و، درۆیش هەوێنی بەدکارییە، مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگەی خراپە، کردەوەی خراپیش مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگەی ئاگری دۆزەخ، موسوڵمانی وا هەیە

---

١- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

سەردەکاتە درۆکردن و هەر درۆ دەکات، تا دەبێت بەدرۆزن و لای خوا بەدرۆزن لەقەڵەم دەدرێت." [1]

ئەبو الجوزائی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: لە (حەسەنی کوڕی عەلی)م پرسی (ڕەزای خوایان لێبێت):"چیت لە پێغەمبەری خواوە لە مێشکتدا تۆمار کردووە؟".

ئەویش وەڵامی دایەوە:"ئەو شتە فەرامۆش بکە کە گومانت بۆ دروست دەکات، بەرەو ئەو شتە برۆ کە لێی دڵنیایت تا دەیگەیتێ. چونکە ڕاستگۆیی دڵنیایی دڵەو درۆش گومانە". [2]

## خوای گەورە چۆن چاکەی بچووك مەزن دەکات؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:" هەرکەسێك لە شتە پاکەکانی خێرێك بکات – کە خوای گەورە تەنها شتی پاك قبولٚ دەکات– ئەوا خوای گەورەو بەبەزەیی ئەو خێرە بەدەستی ڕاستی وەردەگرێت –کە هەردوو دەستی ئەو ڕاستە– تەنانەت ئەگەر ئەو خێرە دەنکە خورمایەکیش

---

١– هەردوو پێشەوا بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

٢– پێشەوا ترمزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە.

بێت، ئەوا لە مشتی خوای گەورەدا گەورە دەبێت تا لە شاخێك گەورەتر دەبێت. هەروەك چۆن ئێوە جوانو و مالآت گەورە دەکەن (ئەویش خێرو چاکەکانی ئێوە گەورە دەکات)".[1]

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: یەك درهەم بەهای لە سەد هەزار درهەم زیاترە.

هاوەڵان لێیان پرسی: "ئەمە چۆن دەبێت ئەی پێغەمبەری خوا؟".

ئەویش فەرمووی:"پیاوێك ماڵ و سامانێکی زۆری هەیە. سەد هەزاری لە سامانەکەی داوە بە خێر. پیاوێکی دیکەش تەنها دوو درهەمی هەیە، یەکێکیان دەکات بە خێر".[2]

## خوای گەورە بە چ شێوازێك پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە؟

لە ئەبو زەڕەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە کە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لە پێغەمبەریان پرسیوە:"ئەی پێغەمبەری خوا! خاوەن سەروەت و سامانەکان پاداشتەکانیان وەرگرت و ڕۆیشتن. ئەوان بەهەمان شێوەی ئێمە نوێژ دەکەن و

١- پێشەوا بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

٢- پێشەوا نەسائی ڕیوایەتی کردوە.

هەروەك ئێمەش ڕۆژوو دەگرن. لەسەرو ئەوەشەوە لەو سەروەت و سامانەی هەیانە خێرو خێرات دەکەن".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەی خوای گەورەش چەند شتێکی بۆ ئێوە داناوە کە وەك خێر وایە بۆتان؟ گومانی تێدا نیە کە هەر (سبحان الله)یەك بە خێرێك بۆتان دەنوسرێت، هەر (الله أكبر) ێك بە خێرێك بۆتان دەنوسرێت، هەر (الحمدلله)یەکیش بە خێرێك و هە (لا إلە إلا الله)یەکیش بەخێرێك بۆتان دەنوسرێت. بەرامبەر هەر ڕێنیشاندانێك بەرەو کارێکی چاکە خێرێکتان بۆ دەنوسرێت و بەرامبەر هەر ڕێگرتنێکیش لە کارێکی خراپە خێرێکتان بۆ دەنوسرێت. تەنانەت هەریەکێك لە ئێوە ئەگەر لەگەڵ خێزانەکەیدا جیماع بکات ئەوا خێرێکی بۆ دەنوسرێت".

هاوەڵان پێیان وت:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئایا ئەگەر هەریەکێك لە ئێمە ئەوەی ئارەزووی دەیەوێت لەگەڵ خێزانەکەیدا بیکات خێری بۆ دەنووسرێت".

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "پێم بڵێن، ئایا ئەگەر ئەو ئارەزووەی لەڕێگەی حەرامەوە ئەنجام بدات، ئەوا بە خراپە بۆی نانوسرێت؟ کەواتە ئەگەر ئارەزووی لەڕێی حەڵاڵەوە ئەنجام بدات ئەوا خێرێکی لە پاداشتدا بۆ دەنوسرێت".

ئەبو زەڕی غەفاری (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ لە فەرموودەیەکی (قودسی)دا پێمان

دەفەرموێت و دەڵێت: خوای گەورە فەرموویەتی:"ئەی بەندەکانم، بەڕاستی من زوڵمم لەخۆم حەرام کردووە. لەنێو ئێوەشدا حەرامم کردووە. لەبەر ئەوە زوڵم لەیەکتری مەکەن".

ئەی بەندەکانم، هەمووتان لە تاریکیدان تەنها ئەو کەسە نەبێت کەخۆم هیدایەتم داوە. لەبەرئەوە داوای هیدایەت و ڕێنیشاندانم لێ بکەن تا منیش هیدایەتیان بدەم و بەرەو ڕێی ڕاستتان ببەم. ئەی بەندەکانم، هەمووتان برسین تەنها ئەو کەسانە نەبێت کەخۆم تێریان دەکەم. لەبەرئەوە داوای ئەوەم لێ بکەن کە تێرتان بکەم (نانتان بدەمێ) تا منیش تێرتان بکەم. ئەی بەندەکانم هەمووتان ڕووت و بێ بەرگن تەنها ئەوانە نەبێت کەمن پۆشتەیان دەکەم. لەبەرئەوە داوای ئەوەم لێ بکەن کە پۆشتەتان بکەم، تا منیش پۆشتەتان بکەم. بەندەکانم، ئێوە شەوو ڕۆژ تاوان ئەنجام دەدەن و منیش بەردەوام لە تاوانەکانتان خۆش دەبم. لەبەرئەوە دوای لێخۆشبوونم لێ بکەن تا لێتان خۆش ببم. بەندەکانم، ئێوە هەرگیز ناتوانن زیان بە من بگەیەنن تا زیان پێگەیاندنی ئێوە بۆ من ببێتە مایەی لێدوان و. هەرگیز ناتوانن سوودم پێبگەیەنن تا سوود پێگەیاندنتان بۆ من ببێتە مایەی لێدوان. بەندەکانم، ئەگەر سەرەتاو کۆتاییتان و جنۆکەو مرۆڤتان بەڕادەی تەقوای لە خواترسترین کەس لەناوتاندا بەتەقواو لەخواترس بن ئەوا هیچ لە

موڵـك و سـامانی مـن زیـاد ناكـات، بەنـدەكانم، ئەگـەر سـەرەتاو كۆتاییتـان و جنۆكـەو مرۆڤتـان بـەڕادەی گوناهكـارترین كـەس لەناوتاندا گوناهكار بن ئەوا هیچ شتێك لە لەموڵك و سامانی من كـەم ناكات. بەندەكانم، ئەگەر هەر هەمووتان بەسەرەتاو كۆتاییتانەوە بە جنۆكەو مرۆڤتانەوە لەسەر تەپۆلكەیەك كۆببنەوەو داوام لێ بكـەن و دوعـا بكـەن و هەریـەكێكتان ئـەوەی داوای كـردووە بیـدەمێ تـەنها بەقەدەر ئـەوە لـەموڵكی مـن كـەم دەكـات كـە سـەرە دەرزیـەك لـە دەریایـەكی، كـەم دەكـات ئەگـەر بیكەیتـە نـاو دەریاكـەو دەریبهێنیتەوە. بەندەكانم، هەرچیەك بكـەن ئەوانـە كـاروكردەوەی ئێوەن. من ئەو كردەوانەتان بـۆ دەژمێـرم و دەیـان چەسـپێنم و لـە دواییـدا بـە بێكـەم و كـورتی دەیاندەمـەوە دەسـت خۆتـان. هەریەكێكتان ئەگەر خێرو چاكەی بینیەوە ئەوا با سوپاسـی خـوای گەورە بكات و هەر یەكێكیشتان ئەگەر جگـە لەمـە شـتێكی دیكـەی بینییەوە ئەوا با جگە لەخۆی لۆمەی كەسی تر نەكات".

ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: "هەركەسـێك نەهامەتیـەكی دونیـا لەسـەر موسـوڵمانێك سـووك بكـات. ئـەوا خـوای گـەورە یـەكێك لـە نەهامەتیـەكانی ڕۆژی دوایـی لەسـەر سـووك دەكـات. هەركەسـێك ئاسانكاری بۆ كەسێك بكـات كـە لـە نارەحەتیـدا بێـت، ئـەوا خـوای گەورە لە دونیاو دواڕۆژدا ئاسانكاری بۆ دەكات. هەركەسێك هەڵـەی

موسـولمانێك داپۆشـێت ئـەوا خـوای گـەورە لـەدونیاو دوارۆژیشـدا هەڵەكانی دادەپۆشێت. هەركەسێك بەردەوام بێت لـەوەی یارمـەتی برا موسـولمانەكەی بـدات، ئـەوا خـوای گـەورەش بـەردەوام دەبێـت لەیارمەتیـدانی ئـەو كەسـە. هەركەسـێك ڕێگایـەك بگرێتەبـەر بـۆ بەدەستهێنانی زانست ئەوا خوای گەورە ڕێگایەكی بەرەو بەهەشتی بەرین بۆ ئاسان دەكات. ئەگـەر هـەر كۆمەڵـە خـەڵكێك لـەماڵێك لـە ماڵەكانی خوای گەورەدا كۆببنەوەو لەوێدا قورئانی پیرۆز بخـوێنن و لەناو خۆیاندا دیراسـەی بكـەن، ئـەوا بێگومـان سـەكینەت و ئـارامی بەسەریاندا دەبارێت. ڕەحمەت و بەزەیی دەیانگرێتەوە. فریشتەكان دەوریان دەگرن و خوای گـەورەش لای ئەوانـەی چواردەوری خـۆی باسـیان دەكـات، هەركەسـێك كاروكردەوەكـانی خـۆی دوای بخـەن، ئەوا نەسەب و ڕەچەڵەكەكەی پێشی ناخەن.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: گوێم لە پێغەمبەری خـوا بووﷺ دەیفەرموو: خوای گەورەو میهرەبان فەرموویەتی:

-"ئـەی نـەوەی ئـادەم، تـۆ ئەگـەر دوعـات كـردو ئومێـدت پـێم هەبوو، ئەوا من لەو كردەوانەت خۆش دەبم كە ئەنجامت داوەو هـیچ گوێی پێ نادەم. ئەی نەوەی ئادەم، ئەگەر تاوانەكانت ئەوەندە زۆر بـن كـە بگەنـە ئاسمـان، بـەڵام دوای ئـەوە داوای لێخۆشـبوونم لێ بكەیت، ئەوا مـن لـە تاوانـەكانت خـۆش دەبم. ئـەی نـەوەی ئـادەم، ئەگەر تۆ پڕ بەزەوی تـاوان بكـەیت و بێیتـە بـەردەمم، بـەڵام پـێش

ئەوەی هیچ شتێك بكەیتە هاوبەش بۆم بێیتە خزمەتم، ئەوا منیش پڕ بەزەوی عەفوو لێخۆشبوونت بەسەردا دەبارێنم".

## پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەبەردەوامی كام نزایانەی دەخوێند؟

ئەو ئایەتە پیرۆزانەی ناو قورئانی پیرۆز كە پەیوەندییان بە نزاو پاڕانەوەوە هەیە:

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ.... ﴾ غافر: ٦٠، واتە: خودای ئێوە وتی: بانگ بكەنە من، بەدەنگتانەوە دێم .

﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾ الأعـــــراف: ٥٥، واتە: بە ترس و گریان و خوشووعەوە لە خودای خۆتان بپاڕێنەوە بە پەنامەكی، خودا ئەو كەسانەی خۆش ناوێ لە دوعاو پاڕانەوەدا لە ڕێگای شەرع لا ئەدەن و داوای شتی ناڕەوا ئەكەن یا بە بێ مەعنا لە دوعا كردندا دەنگ بەرزئەكەنەوە.

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ البقـــــرة: ١٨٦ ، واتە: ئەگەر بەندەكانم دەربارەی من لێیان پرسیت پێیان بڵێ: من لێیانەوە نزیكم و ئاگام لە حاڵ و كردەوەیانە، هەركەس بانگم لێ

بکات ئاگام لێیەو، وەڵامی ئەدەمەوەو فریای ئەکەوم. کەواتە کە بانگم کردن بۆ عیبادەت و بەگوێکردنم با ئەوان بەگوێم بکەن و، ئیمانم پێبهێنن بەڵکو بگەنە حەق و ڕێگای ڕاستی بگرنەبەر.

﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾ النمل: ٦٢، واتە: یاخود کێیە ئەوەی دوعای داماوان قوبوڵ ئەکا کاتێ لێی بپاڕێنەوەو شتی خراپەو ناخۆش لە ئادەمزاد لائەداو ئەتانکا بە جێگرەوەو جێنشینی پێشینەکانتان لە زەویدا؟ ئایا خوایەکی تر هەیە لەگەڵ خوادا هاوبەشی بێ لە کردنی ئەم کارانەدا؟ نەخێر نییە بەڵام ئێوە زۆر کەم وا ئەبێ بیربکەنەوەو ئەم ڕاستییە بزانن.

دوعاو پاڕانەوە مانایەکی گرنگ و جیاوازی هەبوو لە ژیانی پێغەمبەری سەروەرمانداﷺ. ئەو بەردەوام لە دوعاو ڕازو نیازدا بوو لەگەڵ پەروەردگارو بەدیهێنەری خۆیدا، بەردەوام ئامۆژگاری مرۆڤەکانی دەوروبەری دەکرد کە ڕووبکەنە خالق و بەدیهێنەرەکەیان و فێری ئەوەی دەکردن کە بە چ شێوازێك دوعا بکەن.

## ئەمانەش هەندێکن

## لە نزاکانی پێغەمبەرﷺ :

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرموویەتی: "دوعا خواپەرستیە".

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: "پێغەمبەری خواﷺ نزای کورت و پوختی پێ خۆش بوو، هەرگیز دوعای نەدەکرد کە کورت و پوخت نەبوایە".

عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: نوێژم دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرمووم:"نزاکانت بەتەواوی و کورت و پوختی بخوێنە !".

کاتێك کە نوێژەکەم تەواو کرد پرسیاری ئەوەم لێ کرد کە ئایا نزای کورت و پوخت چۆن دەکرێت؟ ئەویش فەرمووی:"بەم شێوەیە لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە: پەروەردگارم، من هەموو ئەو چاکانەی کە دەیانزانم و هەموو ئەو چاکانەی کە نایانزانم لەتۆ دەخوازم، هەروەها هەموو ئەو چاکانەت لێ دەخوازم کە بەندەو پێغەمبەری نێردراوتﷺ لێی داوا کردویت".

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) مۆڵەتی لێوەرگرتم کە بێتە ژوورەوە بۆلام، بەڵام من

لەوکاتەدا نوێژم دەکرد. دەستم کێشا بەیەکدا، بەڵام ئەو لەوە تێنەگەیشت، پاشان پێغەمبەری خوا هات. هەردووکیان لەودیو دەرگاکەوە چاوەڕوان بوون. پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرمووم: "ئەو شتە چیە کە وات لێدەکات پوختەی قسەکان نەڵێیت؟".

لێم پرسی: "ناوەڕۆکی هەموو وتەکان چیە ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەوەی کە بڵێیت: ئەی پەروەردگارم، هەموو ئەو خێرو چاکانەی دەیانزانم و کە نایانزانم و کە لە دونیاو دواڕۆژدا هەن لەتۆ دەخوازم. ئەی پەروەردگارم پەنا بە تۆ دەگرم لەهەموو ئەو خراپانەی دەیزانم و نایزانم، هەروەها پەنات پێ دەگرم لەهەموو ئەو خراپانەی کە لەم دونیاو لە دواڕۆژدا هەیە. پەروەردگارم کۆتایی ئەو شتانەی بەسەرمدا دێت باش بکە".

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: زۆربەی کات پێغەمبەری خواﷺ بەم شێوەیە نزای دەکرد: "اللّهُمَّ آتنا في الدُنيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرةِ حَسَنةً وقِنا عَذابَ النّار".

واتە: خوایە گیان لەدونیاداو لەڕۆژی دوایشدا خێرو چاکەمان پێ ببەخشە و هەروەها لە ئەشکەنجە و ئازاری ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

لە ڕیوایەتی (مسلم)دا ئەمەش هاتووە: "کاتێك ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) تەنها یەك نزای بخوێندایە، ئەوا ئەم نزایەی دەخوێند.

کاتێکیش چەند نزایەکی بخوێندایە ئەوا لەناویاندا ئەم نزایەشی دەخوێند".

لە ئیبن مەسعودەوە پێمان گەیشتووە (ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەری خواﷺ بەم شێوەیە دوعای دەکرد: "اللّهُمَ إنّي أسألُكَ الهُدى والتُّقى و العَفافَ والغنى".

واتە: پەروەردگارم، داوای هیدایەت و لەخوا ترسی و داوێنپاکی و دەوڵەمەندیت لێدەکەم".

تاریقی کوڕی ئەشیەم (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: کاتێک یەکێك موسوڵمان بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا فێری نوێژکردنی دەکردو پاشان ئامۆژگاری ئەوەی دەکرد کە بڵێت:"اللّهُمَ أغفِر لِي وارْحَمني واهدِني وعافِني وارزُقنِي".

واتە: پەروەردگارم، لێم خۆش ببە، ڕەحمم پێ بکە، ڕێگەم نیشان بدە کە ئەو کردەوانە بکەم کە تۆ پێت خۆشە، هەروەها لەش ساغی و ڕزق و ڕۆزیەکی حەڵاڵم پێ ببەخشە.

هەروەها موسلیم لە تاریقی کوڕی ئەشیەمەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: کاتێك تاریق گوێ بیستی پێغەمبەر بوو کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ لێی پرسی:

-"ئەی پێغەمبەری خوا! کاتێك شتێکم لەخوای گەورە دەوێت چۆن نزا بکەم و لێی بپاڕێمەوە؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "بڵێ:"اللّٰهُمَّ آغغفر لِي وارْحَمني واهدِني وعافِني وارزُقنِي".

واتە: پەروەردگارم، لێم خۆش ببە، ڕەحمم پێ بکە، لەش ساغی و ڕزق و ڕۆزیەکی حەلاڵم پێ ببەخشە.

ئەم وتانە هەموو ئەو شتانە دەگرێتە خۆی کە لە دونیاو دوارۆژیشدا دەتەوێت".

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ بەم شێوەیە نزای دەکرد:"اللّٰهُمَّ یا مُصَرِّفَ القُلوُب! صَرِّفْ قُلُوبَنا على طاعَتِكْ".

واتە: ئەی ئەو پەروەردگارەی دڵەکان ئاڕاستە دەکەیت! دڵەکانمان ئاڕاستە بکە بەرەو تاعەت و گوێڕایەڵی خۆت!".

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"پەنا بەخوا بگرن لە دەردێك کە بەرگە ناگیردرێت، لە بەدبەختییەك کە مرۆڤ بەرەو فەوتان دەبات، لە هەموو خراپەیەك کەبەسەرتاندا دێت وە لە هەموو بەڵاو نەگبەتییەك کە دڵی دوژمنی پێ خۆش دەبێت".

هەر لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خواﷺ بەم شێوازە نزای دەکرد: "اللّٰهُمَّ أصلِحْ لِي دِيني الذي هُوَ عِصمَةُ أمري، وأصْلِحْ لِي دُنياىَ التِي فيها مَعاشي،

واصْلِحْ لي آخِرَتي التي فيها مَعادي واجْعَلِ الحَياة زيادَةً لي مِن كُلِّ خَيرٍ، واجْعَلِ المَوتَ راحَةً لي مِنْ كُلِّ شَرٍّ".

واتە: خوایە کاری ئەو دینەم بۆ ساز بکە کە جەمسەری هەموو کارێکمە، کاری دونیایەکم بۆ ساز بکە کە مەڵبەندی ژیانمە، ئەو قیامەتەم بۆ ساز بکە کە جێگای گەڕانەوەمە، تەمەن درێژم بکە لەکاتی هەموو چاکەیەکدا، بە مردن سەرفرازم بکە لەکاتی هەموو خراپەیەکدا.

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ پێمی فەرموو: "بڵێ: اللّهُمَّ اهْدِني وسَدِّدني".

واتە: پەروەردگارم، بەرەو ڕێی ڕاستم ببەو لەسەر ئەو ڕێیە سەرکەوتووم بکە.

لە ڕیوایەتێکی دیکەشدا هاتووە، فەرموویەتی: "اللّهُمَّ إني أسألُكَ الهُدى وأسألُكَ السَّداد".

لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خواﷺ بەم شێوەیە نزای کردووە: "اللّهُمَّ إني أعوذُ بِكَ مِنَ العَجزِ والكسَل والجُبْنِ والهَرَم والبُخلِ، وأعوذُ بِكَ من عَذابِ القَبر، وأعوذُ بِكَ مِنْ فِتنةِ المَحيا والمَمات".

واتە: پەروەردگارم، پەنات پێ دەگرم لە بێ دەسەڵاتی و تەمبەڵی و ترسنۆکی و ڕژدی، لەپیری و بەخیلی. هەروەها پەنات

پێ دەگرم لە سزاو ئەشکەنجەی ناو گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە تاقیکردنەوەی ژیان و مردن.

لە ڕیوایەتێکی دیکەشدا هاتووە: "......وَضَلَعِ الدَّيْن وَغَلَبَةِ الرِّجالِ".

واتە: هەروەها پەنات پێ دەگرم لە پشت چەمانەوە بەهۆی قەرزارییەوەو لە دۆڕانی پیاوانی ئیسلام و شکست هێنانیان.

ڕۆژێك ئەبو بەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێت) بە پێغەمبەری خوای وتﷺ: "نزایەکم فێر بکە تا لە نوێژەکانمدا بیخوێنم".

پێغەمبەری خوایشﷺ پێی فەرموو: "بڵێ: اللّهُمَّ إنّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلا أنْتَ، فاغْفِر لي مَغْفِرةً مِنْ عِندِكَ وأرْحَمْني إنَّكَ أنْتَ الغفور الرَّحيم".

واتە: پەروەردگارم، من ستەمی زۆرم لە خۆم کردووە. جگە لەتۆ کەس لە تاوانەکان خۆش نابێت. لەبەرئەوە بە لوتفی بێ کۆتایی خۆت لێم خۆشبە، ڕەحمم پێ بکە. چونکە تەنها تۆیت کە خاوەن لێخۆشبوون و بەزەیی بێ کۆتاییت.

بەپێی ڕیوایەتێك لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەیشتووە، کە پێغەمبەری خوایﷺ بەم شێوەیە نزای کردووە: "اللّهُمَّ اغفر لِي خَطيئَتي وجَهْلي وإسْرافي في أمري وما أنتَ أعْلَمُ بِهِ مِنّي. اللّهُمَّ أغفر لِي جِدّي وهَزْلي، و خَطَئي وعَمْدي وكُل ذلِكَ عِنَدِي. اللّهُمَّ أغفر لِي ما قَدَّمْتُ وما أخَّرت، وما أسْرَرتُ وما أعْلَنت وما

أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنّي. أَنْتَ المُقَدِّمُ وَ أَنْتَ المُؤَخِّرُ، وأَنْتَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ".

واتـه: پـەروەردگارم، ببـوره لـه تـاوان و نـەزانيم و، لەسـنوور دەرچوونی کاروبارم و، هـەموو ئـەو هەڵانەشـم کـه تـۆ لـەمن باشـتر دەيانزانيت. خودايه له جديات و گاڵتەکانم هەروەها ئەو هەڵانەم کـه بەزانينـەوه ئـەنجامم داون و ئـەو هەڵانـەش کـه بـەهۆی نەزانينـەوه ئەنجامم داون خۆش ببه. من دان بەهەموو ئەو هەڵانەدا دەنێم که له مندا هەن. پەروەردگارم له هەموو ئەو گوناهانەم خۆش ببـه کـه تـا ئێستا ئەنجامم داون و دوای ئێستا ئەنجاميان دەدەم. هەروەها لـەو هەڵانەشم خۆشبه که شاردوومەتەوەو ئەو هەڵانەش کـه بـه ئاشـکرا ئەنجامم داون هەروەها هەموو ئـەو هەڵانـەش کـه تـۆ لـه مـن باشـتر دەيانزانيت تۆ پێشـخەرو دواخـەری هـەموو شـتێکيت. بەڕاسـتی تـۆ بەتوانای بەسەر هەموو شتێکدا.

له عائيشەوه (ڕەزای خوای لێبێت) پێمان گەيشتووه پێغەمبەری خوا ئەم نزايەی خوێندووه: "اللّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ ما لَمْ أَعْمَلْ".

واته: پەروەردگارم، من پەنا به تۆ دەگرم له خراپەی هەموو ئەو کردەوانەی که تا ئێستا ئەنجامم داون هەروەها ئەو کردەوانـەی کـه تائێستا ئەنجامم نەداون.

ئـیبن عومـەر (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: یـەكێك لـەو نزایانەی كە پێغەمبەرﷺ دەیخوێند ئەمە بوو: "اللّهُمَّ إنِّي أعـوُذُ بِـكَ من زَوال نِعْمَتِكَ وَتَحوُّلِ عَافِيَتِكَ وَ فُجْئَتِ نِقْمَتِكَ وَ جَمِيعِ سَخَطِك".

واتـە: پـەروەردگارم، پـەنات پـێ دەگـرم لـە نـەمانی ئـەو نـازو نیعمەتەی كـە پێـت بەخشـیوم و شـێوانی ئـەو لـەش سـاغییەی كـە پێتداوم. هەروەها پەنات پێ دەگرم لە سزای لەناكاو و كت وپـڕت و هەموو تووڕەبوونێكت بەسەرمدا.

لە زەیدی كوڕی ئەكرەمـەوە پێمـان گەیشـتووە كـە پێغەمبـەری خواﷺ بەم جۆرە نزای خوێندووە: "اللّهُـمَّ إنـي أعـوذُ بِـكَ مِـنَ العَجْـزِ والكَسَل والجُبْنِ والبُخل والهَرَم وعَذابِ القَبر. اللّهُمَّ آتـي نَفْسـي تَقوُاهـا وزَكّيها أنْتَ خَيرُ مَنْ زَكّاها، أنتَ وَلّيُها ومولاهَا. اللّهُمَّ إنّي أعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْـمٍ لا يَنْفَـعْ ومِـنْ قَلْـبٍ لا يَخشَـعْ وَمِـنْ نَفْـسٍ لا تشـبَعْ وَمِـنْ دَعْـوَةٍ لا يُسْتَجابُ لَها".

واتە: پەروەردگارم، پەنا بەتۆ دەگرم لە تەمەڵی و بێ دەسەڵاتی و ترسنۆكی و بەخیلی و لەپیری و ئیحتیاج بوون بە خـەڵكی و سـزاو ئەشكەنجەی نـاوگۆڕ. خوایـە تـەقوا بخـەرە نـاو دەروونم و خـاوێنی بكە، خۆت باشـترین خاوێنكـاری، تـۆی گـەورەو سەرپەرشـتیكاری. خوایە گیان، پەنات پێ دەگرم لە زانستێك سوودی نەبێت و لە دڵێك كەملكـەچ نـەبێت لـە نەفسـێك كـە تێرنـەبێت . هـەروەها لـەنزاو پاڕانەوەیەك كە وەڵام نەدرێتەوە.

# خوای گەورە چ پاداشتێك دەدات بەو کەسەی کە نەدارێك پۆشتە دەکات؟

ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە جارێك سواڵکەرێك هاتۆتەلای، ئەویش لە سواڵکەرەکەی پرسیوە:

-"تۆ شایەتی ئەوە دەدەیت کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) و هەروەها بەوەش کە (محمد) نێردراوی ئەوە؟".

سواڵکەرەکە وتی:"بەڵێ!".

لێی پرسی:"ئایا ڕۆژوو دەگریت؟"

سواڵکەرەکە ئەمجارەش وتی:"بەڵێ!".

ئیبن عەباس پێی وت:"تۆ داوات کرد. داواکەریش مافێکی هەیە. هەروەها ئەوەش ئەرکی ئێمەیە کە یەکێك داوای شتێکی کرد بیدەینێ".

پاشان پۆشاکێك دەدات بە سواڵکەرەکەو دەڵێت:"گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ دەیفەرموو: "هەر موسوڵمانێك کە موسوڵمانێکی دیکە پۆشتە بکات ئەوا بێگومان تا پارچەیەك لەو پۆشاکەی کە داویەتی بەوی تر بەبەریەوە بێت لە پارێزگاری خوای گەورەدایە ".[1]

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

## ئەو شتە چیە کە مرۆڤ

## لە مەرگی خراپ دووردەخاتەوە؟

ئــەبو هــورەیرە (ڕەزای خــوای لێبێــت) بۆمــان دەگێڕێتــەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویـەتی:"صـەدەقەو خێـر تـووڕەیی خـوای گەورە خامۆش دەکاتەوە و مردنی خراپ وەلا دەنێت".

### ئامۆژگـاری پێغەمبــەرﷺ بــۆ فاتمــە و عــەلی (ڕەزای خوایـان لێبێـت) چـی بـوو بـۆ خۆشـبەختی لـە دونیـاو دوارۆژدا؟

ڕۆژێـك حـەزرەتی عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێـت) بـە فاتیمـەی وت (ڕەزای خــوای لێبێــت):"ســوێند بــەخوا لــە تیژکردنــەوەی بــەردی دەستاڕ سنگم نارەحەت و قورس بووە، خـوای گـەورە دیلێکـی بـۆ باوکت ناردووە. بـۆ ناچیت داوای لێ بکـەیت، بەشـکم ئـەو کۆیلەیـە یارمەتیم بدات لە کارەکانمدا".

فاتیمــە (ڕەزای خــوای لێبێــت) وتــی:"ســوێند بــەخوا منــیش دەستەکانم ئاوساون لەتاو ئارد هاڕین".

ئەمـەی وت و هەسـتا تـا بچێتە خزمـەت پێغەمبـەری خـواﷺ. پێغەمبــەرﷺ بــە فاتیمــەی فــەرموو: "کچــی ئــازیزم، لەبــەر چــی هاتوویت؟".

فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: "هاتم تا سڵاوت لێ بکەم!".

بەڵام شەرمی کرد ئەوەی ئەیویست بیڵێت و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) پێی وت: "چیت کرد؟".

فاتیمە وتی:"شەرمم کرد لەوەی دەمەوێت پێی بڵێم!"

لەبەرئەوە هەردووکیان پێکەوە چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺ .

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: "سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ، لەتاو تیژکردنەوەی دەستاڕ سنگم ناڕەحەت بووەو قورس بووە".

فاتیمە(ڕەزای خوای لێبێت) وتی:"منیش لەتاو ئارد هاڕین دەستەکانم ئاوساون. بەڵکو ئەو دیلەی خوای گەورە بۆی ناردوویت بینێریت بۆ ئێمە تا خزمەتمان بکات تا کەمێك بحەوێینەوە و بەهێز بینەوە!".

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:"سوێندبەخوا من ئەوتان نادەمێ تا خزمەتتان بکات!

من هێشتا شتێکم پەیدا نەکردووە -خوێندنگەی ئەو قوتابیانەی پێویستیان بە یارمەتیە- پۆشتە بکات و سکیان تێر بکات، من ئەو ئەفرۆشم و ئەوانی پێ بەڕێ دەکەم."

فاتیمەو عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت) گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان.

پێغەمبەری خواﷺ چووە لایان و پێی فەرموون: " شتێکتان پێ بڵێم کە لەو شتەی داواتان کردبوو خێرترو باشتر؟

وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خواﷺ پێمان بڵێ!"

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:"کاتێك دەچنە ناو جێگەکەتانەوە بخەون ئەوا (٣٣)جار (سبحان الله) و (٣٣) جار (الحمدلله) و (٣٣) جار (الله أكبر) بکەن. ئەی فاتیمە! لەخوا بترسە! فەرمانی خوای گەورە بەجێبهێنەو هەروەها خزمەتی مێردەکەت بکە!".

فاتیمەش (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:"من لەخوای گەورەو لە پێغەمبەری خوا ڕازیم!" ئەو ئەم وتەیەی دووجار دووبارە کردەوە.

## ئایا پاداشتی خەرجیکێشانی مالّ و خێزان چییە؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"دینارێك هەیە لەڕێی خوای گەورەدا خەرجی دەکەیت، دینارێك هەیە بۆ ئازادکردنی کۆیلەیەك خەرجی دەکەیت، دینارێك دەیکەیتە خێر بۆ فەقیرو هەژاران، وە دینارێکیش هەیە کە بۆ ماڵ و خێزانەکەت خەرجی دەکەیت. لەم دینارانەدا (کە لەکاری چاکەدا خەرجت کردوون) ئەو دینارەی کە لەهەموویان زیاتر پاداشتت بۆ دەهێنێت ئەوەیانە کە بۆ ماڵ و خێزانەکەتی خەرج دەکەیت".[1]

---

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

ئەبو مەسعودی بەدری (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "ئەگەر موسوڵمان خەرجیەك بۆ خێزانەکەی بکێشێت (هەرچەند واجبە لەسەری) بەڵام -ئەگەر مەبەستی ڕەزامەندی خوابێت- بەخێر بۆی دەنووسرێت".[1]

## ئەو کارە چیە کە مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێت؟

عەدی کوڕی حاتم (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-" خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، تەنانەت ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت."

## چ خێرێك بالآترە؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك بە پێغەمبەری خوایانﷺ وت : "ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا چ خێرێك لە هەمووی بالآترە؟".

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "بەخشندەیی هەژار لە هەمووی باڵاترە".[1] تۆ لەوانەوە دەست پێ بکە کە بەرپرسیاریت لە چاودێریکردنیان.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

-"ماڵ و سامان بەصەدەقەو خێر کەم ناکات".

-"خوای گەورە بەهۆی بەخشینەوە عیززەتی بەندەکانی زیاد دەکات".

-"ئەو کەسەی لەبەر خوای گەورە بێ فیزی بنوێنێت ئەوا خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە".[2]

## کاتێك خێر دەکەین، تایبەتمەندی ئەو پارەیەی دەیکەین بەخێر دەبێت چی بێت؟

عەوفی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵ چووە دەرەوەو گۆچانەکەی لە دەستدا بوو. بینی پیاوێك هێشوویەك خورمای هەڵواسیبوو کە هەندێکی ڕزی بوو. پێغەمبەری خوا ﷺ گۆچانکەی دا لە خورماکە و فەرمووی:

---

١- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

-"خۆزگە خاوەنی ئەم خێرە، لەمە باشتری بکردایە بە خێر. خاوەنی ئەم خێرە لە ڕۆژی دواییدا خورمای ڕزیو دەخوات".[١]

## لە ئایینی ئێمەدا گرنگی هۆکاری خێرو چاکە چیە؟

جابر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك كۆمەلێك پیاوی نەناسراو هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، ئەم پیاوانە بێ بەرگ و پێ پەتی بوون تەنها پشتەماڵێکی دەشتەکییان لەخۆیان ئاڵاندبوو کە وەك پێستی پڵنگ خەت خەت بوو و شمشێرەکانیان بەملیانەوە شۆڕکردبوویەوە.

کاتێك پێغەمبەری خواﷺ ئەم بارودۆخە هەژارەیانی بینی دەموچاوی گۆڕا. چووە ژوورەکەی خۆی و پاشان گەڕایەوە. داوای لە بیلال کرد (ڕەزای خوای لێبێت) کە بانگ بدات. ئەویش بانگیداو پاشان قامەتی خوێند. نوێژ کرا. دوای ئەوەی لە نوێژەکە تەواو بوون، پێغەمبەری خواﷺ وتارێکی بۆ جەماعەت خوێندو ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبٗا﴾النساء: ١.

---

١- پێشەوا ئەبوداودو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە.

واتە: ئەی ئادەمزادینە! لە خودای خۆتان بترسن، ئەو خودایەی ئێوەی لە نەفسێکی تەنیا، کە ئادەمە، دروست کردوەو، هەر لەویش هاوجووتەکەیی دروست کردوەو، لەم دوانەوە پیاوان و ژنانی زۆری دروست کردوەو بڵاوبوونەتەوە. لەو خودایە بترسن کە بە ناوی ئەوەوە لەناو خۆتاندا داوای شت لە یەکتر ئەکەن. هەروەها خزمایەتی ڕاگرن و مەیپچڕێنن. بێگومان خودا ئاگای لێتانەو ئەتانپارێزێ.

لەپاش ئەوە پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی لەسورەتی (حەشر) خوێند: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ الحشر: ١٨.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! لە خوا بترسن و، با هەرکەسێ سەرنج بدا چیی لەپێش خۆیەوە ئامادە کردووە بۆ سبەینێی و لە خوا بترسن، بەڕاستی خوا خەبەرداره لە هەرچی کە ئەیکەن.

پێغەمبەری خواﷺ بەردەوامی بە وتەکانیداو فەرمووی:"هەریەکێك با لەو دینارە، لەو درهەمە، لەو بەرگانەی کە هەیەتی، لە مشتێك گەنم یان لە مشتێك خورما کە هەیەتی خێرو صەدەقە بکات. ئەو کەسەش کە هیچی نیە، تەنانەت ئەگەر لەتە خورمایەکیش بێت هەوڵ بدات بیکات بەخێر".

کاتێـــک پێغەمبـــەری خـــواﷺ ئەمـــەی فـــەرموو، یـــەکێك لـــە ئەنصارەکان، لـە شـوێنێکەوە بوخچـەیەکی قورسـی هێنـا کـە بـۆی هەڵنـەدەگیرا. پاشـان هەرکەسـەو دەسـتی کـرد بـەوەی کـە شـتێك بێنێت. لای نیوەڕۆ بینیم یەکێك خۆراك و یەکێکی دیکەش پۆشاکی بە بارستە هێنابوو. پێغەمبەری خوام بینی زۆر سوپاسگوزار بوو بـۆ ئەمـەو دەموچـاوی پـیرۆزی وەك ئەسـتێرە دەگەشـایەوە. پاشـان فەرمووی:

"هەرکەسێك نەریتێکی باش لـەناو خەڵکیـدا بـڵاو بکاتـەوە ئـەوە پاداشتی ئەوەی بۆ دەنوسرێت، لەگەڵ پاداشتی ئـەو کەسـانەی کـە بەو نەریتە کاریان کردووە، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئـەوان کـەم ببێتەوە. هەرکەسێکیش نەریتێکی خراپ بڵاوبکاتـەوە، ئـەوا تـاوانی ئەوەو تاوانی هەموو ئەو کەسانەشی بۆ دەنوسرێت، بێ ئەوەی هیچ لە تاوانەکانی ئەوان کەم ببێتەوە".[١]

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

# کاتێك خێرێك دەکەین

## کێ لە پێشترە کە ئەو خێرەی بدەینێ؟

ئــەبو هــورەیرە (ڕەزای خــوای لێبێــت) دەگێڕێتــەوە: ڕۆژێکیــان پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی ئەوەی دا کە خێر بکەین.

پیاوێك پێی وت:"ئەی پێغەمبەری خــوا! مــن تــەنیا یــەك دینــارم هەیە!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەوە بدە بــە خــۆت بــۆ خێــر!" (واتــەبۆ خۆتی خەرج بکە).

پیاوەکە وتی:"ئەی ئەگەر دینارێکی دیکەشم هەبێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەوە بەخێر بدە بە منداڵەکانت".

پیاوەکە وتی:"ئەی ئەگەر دینارێکی دیکەشم هەبێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەوە بە خێر بدە بە خێزانت".

پیاوەکە وتی:"ئەی ئەگەر دینارێکی دیکەشم هەبێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەوە بە خێر بدە بە خزمە نزیکەکەت".

دیسان پیاوەکە وتی:"ئەی ئەگەر دینارێکی دیکەشم هەبێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەوکاتە ئەوەیان خۆت باش دەزانیت بۆ کێی دەکەیت بە خێر".[1]

---

١- ئەبوداود و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە.

## ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەرمانﷺ دەربارەی مافی دراوسێ چی بوون؟

دایکی موسولمانان عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) دەربارەی مافی دراوسێیەتی ئەوەندە بە بەردەوامی ئامۆژگاری کردم، تا وامزانی دراوسێ دەبێتە میراتگر".

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "هەرکەسێك باوەڕی بەخوای گەورەو ڕۆژی دوایی هەیە ئەوا با ڕێز لە میوان بگرێت. هەرکەسێك باوەڕی بەخوای گەورەو ڕۆژی دوایی هەیە ئەوا با لەگەڵ دراوسێکەیدا باش بێت. هەرکەسێك باوەڕی بەخوای گەورەو ڕۆژی دوایی هەیە ئەوا با قسەی خێر بکات یان بێدەنگ بێت".

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: (ڕۆژێك) بە پێغەمبەری خوام وتﷺ: "ئەی پێغەمبەری خوا، دوو دراوسێم هەیە لەپێشدا دیاری بە کامیان بدەم؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "کامیان لە دەرگاکەتەوە نزیکترە ئەوا لە پێشدا بیدە بەو".

# زیانەکانی زویر بوون و دەنگ دابڕین چین؟

ئـەبو ئـەیوب (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویەتی:"هیچ موسوڵمانێك حەڵاڵ نیە بـۆی کـە لـە سـێ ڕۆژ زیاتر لە برا موسوڵمانەکەی زویـر بێـت، واتـە ئەگـەر ئـەو دوانـە ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە هەردووکیان ڕوو لەیـەکتر وەربگێـڕن. لـەم دوو کەسەدا باشـترینیان ئـەو کەسـەیە کـە یەکـەمجار سـەلام لـەوی تریان دەکات".

ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویـەتی:"زویـر بـوون و دەنـگ دابڕینـی باوەڕدارێـك لـە باوەڕدارێکی دیکـە لـە سـێ ڕۆژ زیـاتر حـەڵاڵ نیـە. ئەگـەر سـێ ڕۆژ بەسەر زویر بوونەکەیاندا تێبپەڕێت و یـەکتر ببیـنن، ئـەوا بـا سـەلام لەیەکتر بکەن. ئەگەر ئەوی دیکەش وەڵامی سەلامەکە بداتەوە، ئەوا هەردووکیان لە پاداشتەکەشدا هاوبـەش دەبـن. بـەڵام ئەگـەر ئـەوی تریان وەڵامـی سـڵاوەکەی نەدایـەوە، ئـەوا تاوانەکـە تـەنها بـۆ ئـەو دەنوسرێت".

بەپێی ڕیوایەتێکی دیکەش فەرموویەتی:"هەرکەسێك لە سـێ ڕۆژ زیاتر دەنگی دابڕیبێت و پێش ئاشت بوونەوە بمرێـت ئـەوا دەچـێتە ئاگری دۆزەخەوە".

ئـەبو خراشـی سـولەیمی (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك ساڵێکی ڕەبەق دەنگی لـە بـرا موسـوڵمانەکەی دابڕیبێـت ، ئـەوا ڕێـك وەك ئـەوە وایـە کـە خوێنەکەی ڕشتبێت".

ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویـەتی: "کردەوەکانمـان هـەموو پێـنج شـەممەو دوو شەممەیەك دەبرێتـە خزمـەت خـوای گـەورە. ئـەو ڕۆژە هەرکەسێك هاوتای بۆ خوا پەیدا نەکردبێت ئەوا خوای گەورەش لە گوناهـەکانی خۆش دەبێت، جگە لەو کەسـەی کـە دوژمنایـەتی لەگـەڵ برایەکیـدا هەبێت (لەو خۆش نابێـت) و دەفـەرمووێت واز لـەو دووانـە بێـنن تـا ئاشت دەبنەوە".

## پەسەندترین ئارامگری و دان بەخۆدا گرتن کامەیە؟

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خـواﷺ چـاوی بـە ئافرەتێـك کـەوت کـە بـۆ مردنـی منداڵەکـەی دەگریـا. پێغەمبـەری خـواﷺ پێـی فـەرموو:"لـەخوا بترسـەو دان بـە خۆتـدا بگرە!".

ئافرەتەکە لە سەرلێشواوی خۆی و بێ ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە و بزانێت کێ بوو ئەو قسەیەی کرد، وتی:"ئەوەی کە بەسەر مندا هاتووە بە تۆ چی؟".

کاتێك پێغەمبەری خواﷺ دوورکەوتەوە، بە ئافرەتەکەیان وت:"ئەوە پێغەمبەری خوابوو!".

ئافرەتەکە زانی ئەوە پێغەمبەری خوا بووەﷺ بەڕادەیەك لەو قسەیەی کە بەرامبەر پێغەمبەری خوا کردبووی نیگەران بوو، کە بۆ مردنی منداڵەکەشی هەر ئەوەندە نیگەران بوو بوو. بەپەلە تا لای قاپیی پێغەمبەر ﷺ چوو تا داوای لێبووردنی لێ بکات، بینی هیچ دەرگاوانێك لەبەردەم قاپیەکەیدا نەوەستاوە. یەکسەر چووە ژوورەوە بۆ خزمەتی و وتی:"ئەی پێغەمبەری خوا، نەمزانی ئەوە تۆیت کاتێك ئەو قسە نابەجێیەم کرد، تکایە بمبەخشە".

پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو:"صەبری قبوڵ کراو ئەوەیە کە لەیەکەم ساتی موصیبەتەکەدا کەبەسەرتدا دێت دان بە خۆتدا بگریت".[1]

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

## پاڵەوانی ڕاستەقینە کێیە؟

ئـیبن مەسـعود (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: ڕۆژێـك پێغەمبـەری خـواﷺ پرسـی:"لـەنێو خۆتانـدا کـێ بـە پاڵـەوان دادەنێن؟".

هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) وتیان:"ئـەو کەسـەی کە پیـاوە مەردەکان نەتوانن بەسەریدا سەکەون".

پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: "نـەخێر، پاڵـەوانی ڕاسـتەقینە ئـەو کەسەیە کە لەکاتی تورەبوونیدا بتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات".[1]

ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خواﷺ دەفەرمووێت:"پاڵەوانی ڕاستەقینە ئەو کەسـە بـەهێزە نییـە بەسەر دوژمنەکەیدا سەردەکەوێت، بەڵکو پاڵـەوانی ڕاسـتەقینە ئـەو کەسەیە کە کاتێك تووڕە دەبێت بتوانێت بەسەر خۆیدا زاڵ ببێت".[2]

## کاتێك مرۆڤ تووڕە دەبێت پێویستە چی بکات؟

ئـەبو وائـل (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: چـووینە لای عورووەی کوڕی موحەممەدی سەعدی. یەکێك لەخۆیەوە قسەی کردو عورووەی تووڕە کرد. ئەویش هەستا دەستنوێژی گرت و وتی:"باوکم

---

١- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

٢- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

له عه‌تیه‌ی باپیرمه‌وه (ڕه‌زای خوای لێبێت) بۆی گێڕاومه‌ته‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رموویه‌تی: "تووڕه‌بوون له شه‌یتانه‌وه‌یه، شه‌یتانیش له ئاگر دروست كراوه، ئاگریش به ئاو داده‌مركێته‌وه؛ كه‌واته هه‌ركه‌سێك كاتێك تووڕه‌بوو با هه‌ستێت ده‌ستنوێژ بگرێت".[1]

ئه‌بو زه‌ڕی غه‌فاری (ڕه‌زای خوای لێبێت) ده‌گێڕێته‌وه: پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رموویه‌تی: "هه‌ریه‌كێك له ئێوه كاتێك تووڕه‌بوو ئه‌گه‌ر به‌پێوه بوو ئه‌وا یه‌كسه‌ر با دابنیشێت، ئه‌گه‌ر هه‌ر تووڕه‌بوونه‌كه‌ی به‌رده‌وام بوو ئه‌وا با ڕابكشێت".[2]

موعاذی كوڕی جه‌به‌ل (ڕه‌زای خوای لێبێت) ده‌گێڕێته‌وه: دوو كه‌س له خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خواداﷺ كه‌وتنه شه‌ڕه‌جنێو. (به‌جۆرێك كه له‌چاوی هه‌ریه‌كێكیاندا تووڕه‌بوون به‌رامبه‌ر ئه‌وی دیكه ده‌رده‌كه‌وت)، پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رمووی: "من وشه‌یه‌ك ده‌زانم، ئه‌گه‌ر بیڵێت ئه‌وا ئه‌و تووڕه‌بوونه‌ی تیاتدا به‌دی ده‌كرێت نامێنێت، بڵێ: أَعُوذُ باللهِ مِنَ الشَيطانِ الرَجيم".[3]

سه‌هلی كوڕی موعاذ كوڕی ئه‌نه‌سی جوهه‌نی، له باوكیه‌وه بۆمان ده‌گێڕێته‌وه: پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رموویه‌تی: "هه‌ركه‌سێك

---

١- پێشه‌وا ئه‌بوداود ڕیوایه‌تی كردوه.

٢- پێشه‌وا ئه‌بوداود ڕیوایه‌تی كردوه.

٣- پێشه‌وا ترمزی ڕیوایه‌تی كردوه.

تووڕەیی خۆی بگرێت و تووڕە نەبێت لەکاتێکدا کە توانای ئەوەی هەیە لەکاتی خۆیدا ئەو تووڕەبوونەی دەربڕێت ئەوا لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە لەنێو هەموو بونەوەراندا بانگهێشتی دەکات تا (پێش هەموویان) ئەو حۆرییەی بە دڵیەتی بۆ خۆی هەڵبژێرێت".[١]

## پاداشتی ئەو کەسەی دان بەخۆیدا دەگرێت کاتێك منداڵەکەی دەمرێت چییە؟

ئەبو سینان دەگێڕێتەوە: کاتێك سینانی کوڕمم دەناشت، لە کەناری گۆڕەکەیدا ئەبو تەڵحەی خەولانی دانیشتبوو. کاتێك لەکاری ناشتنەکە تەواو بووم پێی وتم:

-"موژدەیەکت بدەمێ؟"

-وتم: "بەڵێ، بێگومان بیڵێ؟"

ئەویش ئەم وتانەی پێغەمبەری خوایﷺ بۆ گێڕامەوەو وتی: "ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێبێت) پێی وتم: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەك منداڵێکی بمرێت ئەوا خوای گەورە بە فریشتەکان دەفەرمووێت: "گیانی منداڵی بەندەکەمتان کێشا؟" فریشتەکان دەڵێن: "بەڵێ!"، خوای گەورە دەفەرمووێت: "واتە خۆشەویستی دڵیتان لە دەست دەرهێنا؟" فریشتەکان

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

دیسان دەڵێن: "بەڵێ!" خوای گەورە ئەمجارەش دەپرسێت: "بەندەکەم لەو ساتەدا وتی چی؟" فریشتەکان دەڵێن: "لەو ساتەدا سوپاسی تۆی کردو لێت پاڕایەوە".

خوای گەورە دوای ئەوە فەرمانیان پێدەکات و دەفەرموویت: "کەواتە لە بەهەشتدا کۆشکێك بۆ ئەو بەندەیەم دروست بکەن و ناوی لێ بنێن ماڵی سوپاسگوزاری".[1]

## کاتێك خۆشەویستانمان لەدەست دەدەین، پاداشتی ئەو دان بەخۆدا گرتنەی نیشانی دەدەین چیە؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "خوای گەورە فەرموویەتی: "هەرکەسێك دوو خۆشەویستەکەی (جگەر گۆشەکەی و خێزانەکەی) لێ بسەنمەوەو ئەویش بە ئومێدی پاداشت وەرگرتن دان بە خۆیدا بگرێت، ئەوا جگە لە بەهەشت بەهیچ پاداشتێکی دیکە قایل نابم بۆی".[2]

قاسمی کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە: "خێزانەکەم وەفاتی کردبوو، محمدی کوڕی کەعب بۆ سەرەخۆشی کردن هاتە لام و

---

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

٢- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە

ئەمەی بۆ گێڕامەوە: "لەناو بەنو ئیسرائیلدا پیاوێکی زۆر فەقیە و زاناو خواپەرست و بەغیرەت هەبوو. ئەو خێزانەی کە زۆری خۆشدەویست وەفاتی کرد. پیاوەکە بە مردنی ژنەکەی زۆر خەمباربوو بەجۆرێك کە چووە ژوورەکەی و دەرگای لەسەر خۆی داخست و بە هیچ جۆریك نە دەهاتە دەرەوەو نە کەس دەیتوانی بچێتە لای. ئافرەتێك لە بەنی ئیسرائیل ئەم بارودۆخەی ئەم پیاوەی بیست. هاتە لای پیاوەکەو وتی: "من مەسەلەیەکم لەگەڵ خۆیدا هەیە، دەبێت هەر خۆی ببینم و پرسیاری لێ بکەم".

خەڵکەکە هەموو گەڕانەوە، بەڵام ئەو ئافرەتە هەر لەبەردەم دەرگاکەدا مایەوەو دەیگوت: "هەر دەبێت بیبینم!".

یەکێك بە پیاوەکەی ڕاگەیاند: "ئافرەتێك لێرەیە، دەیەوێت شتێك لەتۆ بپرسێت. بەردەوام دەڵێت: دەبێت هەر بیبینم، دەبێت لەخۆی بپرسم. هەموو کەس ڕۆشتن و ئێرەیان بەجێهێشت تەنها ئەو ئافرەتە نەبێت، واز ناهێنێت".

پیاوەکە وتی: "ڕێگەی پێ بدەن با بێتە ژوورەوە".

ئافرەتەکە وتی: "من هاتوومەتە لات تا شتێکت لێ بپرسم".

پیاوەکە پێی وت: "ئەو شتە چیە؟"

ئافرەتەکە وتی: "من ملوانکەیەکم بە ئەمانەت لە دراوسێکەمان وەرگرت، ماوەیەك کردم بەخۆمەوەو بە ئەمانەت بەکارم هێنا.

پاشان ئەوان داوای ئەو ملوانکەیەیان لیٚ کردمەوە. ئایا دەبێت بیدەمەوە پێیان؟"

پیاوەکە وتی:"بەڵێ، سوێند بەخوا دەبێت بیدەیتەوە پێیان".

ئافرەتەکە وتی:"بەڵام ئەو ملوانکەیە ماوەیەك لای من ماوەتەوەو ئێستا زۆر خۆشم دەوێت ".

پیاوەکە وتی:"بەم شێوەیە گێڕانەوەی ملوانکەکە بۆیان زیاتر پێویست دەبێت لەسەرت چونکە ماوەیەکی زۆر بەسەریدا تێپەڕ بووە کە بە ئەمانەت لات ماوەتەوە".

ئافرەتەکە چاوەڕێی ئەم وەڵامەی دەکردو وتی:"خوا چاکەت بداتەوە! ئایا تۆ لەوە خەمباریت کە خوای گەورە ئەو ئەمانەتەی پێشوو پێی دابوویت، ئێستا لێی وەرگرتوویتەتەوە؟" ئایا ئەو لەتۆ زیاتر خاوەنی ئەو شتە نیە کە پێی دابوویت؟"

کاتێك پیاوەکە ئەم ئامۆژگاریەی بیست، سەیری ئەو بارودۆخەی خۆی کرد کە تێیدایە و بەخۆیدا چوویەوە. بەم شێوەیە خوای گەورە وای لەو پیاوە کرد کە سوود لە ئامۆژگاریەکانی ئەو ئافرەتە ببینێت".[1]

---

١- پێشەوا مالك لە (موطأ)دا ڕیوایەتی کردوە.

# پاداشتی دان بەخۆدا گرتنمان لەسەر نەخۆشی چیە؟

عەطائی کوڕی یەسار (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "کاتێك بەندەیەك نەخۆش دەکەوێت ئەوا خوای گەورە دوو فریشتەی بۆ دەنێرێت و پێیان دەفەرمووێت:

-"بڕۆن سەیر بکەن، گوێ بگرن بزانن بەندەکەم چی دەڵێت بە یارمەتیدەرەکانی؟"

ئەگەر ئەو بەندەیە کاتێك فریشتەکان دێنەلای سوپاسی خوای گەورە بکات ئەوا فریشتەکان ئەوە بەرزدەکەنەوە بۆ لای خوای گەورە کە خۆی هەموو شتێك لە هەموو کەس باشتر دەزانێت و خوای گەورەش دەفەرمووێت:

-"ئەگەر گیانی بەندەکەم بکێشم، ئەوا مافی ئەوە بەسەرمەوەیە کە بیخەمە بەهەشتەوەو. ئەگەر شیفاشی پێ ببەخشم ئەوا مافی ئەوە بەسەرمەوەیە کە گۆشتەکەی بگۆڕم بۆ گۆشتێکی باشترو خوێنەکەشی بگۆڕم بۆ خوێنێکی باشتر هەروەها لە تاوانەکانی خۆش ببم".[1]

---

١- پێشەوا مالك لە (موطأ)دا ڕیوایەتی کردوە.

## گرنگی بەزەیی‌و میهرەبانیمان بەرامبەر بە مرۆڤ و خزمەکانمان چیە؟

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"خوای گەورە بە میهرەبانی مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکات کە میهرەبانن. لەبەرئەوە، ئێوە میهرەبان بن بەرامبەر ئەوانەی سەر زەوی، تا ئەوانەشی کە لەئاسماندان میهرەبان بن بەرامبەرتان. هەرکەسێك (پەیوەندی خزمایەتی) بگەیەنێت بیپارێزێت، ئەوا خوای گەورە دەیگەیەنێت بە ڕەحمەتی خۆی. هەرکەسێکیش ئەو پەیوەندیە (خزمایەتییە) بپچڕێنێت، ئەوا خوای گەورەش دایدەبڕێت لە ڕەحمەتی خۆی".[1]

## ئایا خوای گەورە ڕەحم دەکات بەو کەسەی کە ڕەحم ناکات بە خەڵك؟

جەریر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"خوای گەورە ڕەحم بە کەسێك ناکات کە ڕەحم بە مرۆڤەکان نەکات".[2]

---

١- هەردوو پێشەوا ترمزی و ئەبوداود ڕیوایەتیان کردوە.

٢- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

ئەبو داود و ترمذی بەپێی ڕیوایەتێك كە لە ئەبو هورەیرەوە پێیان گەیشتووە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"میهرەبانی، بە ئەستەم لەدڵی مرۆڤی چەتووندا دەبینرێت".

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە:"ڕۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ ماچی حەسەنی کوڕی عەلی کردبوو (ڕەزای خوای لێبێت) لەوکاتەدا ئەقرەعی کوڕی حابس، ئەمەی زۆر پێ سەیر بوو و وتی:" من دە منداڵم هەیە، بەڵام تا ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە".

پێغەمبەری خواﷺ تەماشای ئەقرەعی کردو پێی فەرموو:"ئەوکەسەی ڕەحم بە دەوروبەرەکەی نەکات، خوای گەورەش ڕەحمی پێ ناکات".[1]

ڕەزین دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ ئەمەشی فەرمووە:"ئەگەر خوای گەورە میهرەبانیی لە (دڵی) ئێوە دەرهێنابێت، من چیم پێ دەکرێت؟".

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

# پێوانەی سۆزو میهرەبانی خوای گەورە بۆ بەندەکانی چیە؟

عومـەری کـوڕی خـەتاب (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: کۆمـەڵێك دیـل هێنرانـە خزمـەت پێغەمبـەری خـواﷺ . لەناویانـدا ئافرەتێك هەبوو، سنگی پڕ بوو لە شیر. ئەم ئافرەتە بەلای ڕاست و چـەپی خۆیـدا ڕای دەکـردو کاتێـك لـەناو ئەسـیرەکاندا منـداڵێکی دۆزیـەوە گرتیـە باوەشـی و تونـد لـە ئـامێزی گـرت و نـای بـە سـنگییەوەو شـیری پێـدا. ئـەم دیمەنـە سـەرنجی پێغەمبـەریﷺ ڕاکێشـاو فـەرمووی: "ئێـوە دەچـێتە مێشـکتانەوە ئـەم ئافرەتـە کۆرپەکەی فڕێ بداتە ناو ئاگرەوە؟"

ئێمەش وتمان: "نەخێر!".

پێغەمبەری خواﷺ فـەرمووی: "دەبـزانن کـە ڕەحـم و میهرەبـانی خوای گەورە بۆ بەنـدەکانی لـە بـەزەیی ئـەم دایکـە بـۆ کۆرپـەکـەی زیاترە".[1]

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

## بەرپرسیارێتیمان بەرامبەر بە ئاژەڵان چیە؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "پیاوێك كاتێك بەڕێدا دەڕۆیشت تینووی بوو و تینوویەتیەكەی زۆری بۆ هێنابوو. پاشان بیرێكی بەرچاو كەوت. چووە ناو بیرەكەو تینوێتی خۆی شكاند. كاتێك لە بیرەكە هاتە دەرەوە سەگێكی بینی كە لە تینووێتیدا ڕەنگی زەرد بووە و لەسەر زەوی كەوتوە. پیاوەكە لە دڵی خۆیدا وتی: "ئەو سەگەش ئێستا وەك من تینووی بووە". دیسان چووەوە ناو بیرەكەو كەوشەكانی پڕكرد لەئاوو بەدەمی گرتی تا لەبیرەكە هاتە دەرەوەو پاشان ئاوەكەی دا بە سەگەكە. خوای گەورە بەم كردەوەیەی لێی ڕازی بوو و لەتاوانەكانی خۆش بوو".

هەندێك لەو كەسانەی لە خزمەت پێغەمبەردا بوونﷺ وتیان: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەمە مانای ئەوەیە كە ئەو كردەوە چاكانەی بەرامبەر ئاژەڵانیش ئەنجامی دەدەین، پاداشتی هەیە؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "بەڵێ! چاكە بەرامبەر بە هەموو زیندەوەرێك پاداشتی هەیە".[1]

ئیبن عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "ئافرەتێك بەهۆی پشیلەیەكەوە كە لە

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان كردوە.

ژوورێکدا بەندی کردبوو خرایە ئاگری دۆزەخەوە. ئەو پشیلەیەی بەندکردبوو، نەخۆراکی دەدایە و نە بەرەڵاشی دەکرد خۆی بچێت لەزەویدا خۆراکی خۆی پەیدا بکات".[1]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "نەکەن پشتی وڵاخەکانتان (سواری) بکەنە مینبەر، چونکە خوای گەورە ئەو گیانلەبەرانەی بۆ ڕام کردوون تا بتانگەیەننە وڵاتانێك کە بەبێ سواری نەتاندەتوانی بیانگەنێ، زەویشی بۆ فەراهەم کردوون تا لەسەری پێداویستیەکانی خۆتان جێبەجێ بکەن".[2]

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵا، لە باوکیەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: "ڕۆژێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ پێکەوە بووین. کەمێك بۆ کارێکی خۆی لێمان جیابوویەوە، لەوکاتەدا باڵندەیەکمان بینی کە پێی دەوترێت (حُمَّرة)، دوو بێچووشی هەبوو، باڵندەکە هەڵفڕی و ئێمەش بێچووەکانیمان هەڵگرت. ئەو باڵندە هەژارە لێمان نزیك بوویەوەو دەستی کرد بە پەلەقاژەکردن بەدەورماندا. کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆلامان فەرمووی: "کێ بێچووی ئەم باڵندە بێ

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

٢- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

توانایـەی بـردووەو خسـتویەتیە پەرێشـانیەوە؟ هـەر ئێسـتا بێچووەکەی بۆ بگەڕێننەوە".

جارێکیشیان پێغەمبەری خواﷺ بینی شارە مێروولەیەکمان دەسوتاند، فەرمووی:"کێ ئەمەی سوتاند؟"

ئێمەش وتمان:"ئێمە!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"جگە لەخوا، کەس بۆی نیە بە ئاگر کەسێکی دیکە سزا بدات".[1]

## ئایا بەشەڕدانی ئاژەڵەکان لەگەڵ یەکتردا کارێکی دروستە؟

ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە:"پێغەمبەری خواﷺ وروژاندنی نێوان ئاژەڵان (بۆ مەبەستی بەشەڕدانیان) قەدەغە کردووە".[2]

هەر لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هیچ گیاندارێك مەکەنە نیشان بۆ (تیرهاویشتنی) خۆتان".

شەریدی کوڕی سوەید (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك باڵندەیەك بەبێ هۆو

---

١- پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

٢- هەردوو پێشەوا ئەبوداود و ترمزی ڕیوایەتیان کردوە.

تەنها بۆ ڕابواردنی خۆی بکوژێت، ئەوا ڕۆژی دوایی ئەو باڵندەیە دەنگی بەرز دەبێتەوەو بەخوای گەورە دەڵێت: "ئەی پەروەردگارم! فلان منی لەخۆڕا کوشت، لەبەر هۆکارێکی سوودبەخش نەیکوشتم". [1]

## تایبەتمەندیەکانی ڕەوشت بەرزترین و ژیرترین مرۆڤ چین؟

ئیبن عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: "لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ پێکەوە بووین. یەکێك لە ئەنصارەکان هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و سەلامی لێ کرد. پاشان لێی پرسی: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ . مەردترین موسوڵمان کێیە؟"

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "ئەو کەسەیە کە خووڕەوشتی لە هەموو کەس بەرزتر بێت".

پیاوەکە پرسی: "ئەی ژیرترین موسوڵمان کێیە؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەو کەسەیە کە لەهەموو کەس زیاتر مردنی لەیاد بێت و بۆ دوای مردنیش لەهەموو کەس زیاتر ئامادەکاری کردبێت. ئەو کەسە ژیرترین کەسە".

---

١- پێشەوا نەسائی ڕیوایەتی کردوە.

## فەزڵی داپۆشین و شاردنەوەی عەیب و کەم و کورتی خەڵك چیە؟

عەبـدوڵلای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: ڕۆژێك پێغەمبـەری خـواﷺ چـووە سـەر مینبـەرو بـەدەنگێکی بـەرز فەرمووی: "ئەی ئەو کەسانەی کە بە زمان موسوڵمان بوون و بـاوەڕ نەچـووەتە دڵەکانتانــەوە (دووڕووەکـان)! زیـان بــە موســوڵمانان مەگەیەنن، سەرزەنشتیان مەکەن و مەگەڕێن بـەدوای هەڵـەو کـەم و کورتیەکانیاندا. چونکە هەرکەسێك لـە کـەم و کورتیـەکانی برایـەکی موسوڵمانی بکۆڵێتەوە، ئەوا خوای گەورەش لە کـەم و کورتیـەکانی ئــەو دەکۆڵێتــەوە. هەرکەســێکیش خــوای گــەورە لەهەڵــەکانی بکۆڵێتــەوە ئـەوا تەنانـەت ئەگـەر لـەماڵی خۆیشـیدا بێـت (دوور لـە خەڵك) ڕسوای دەکات".

عوقبــەی کــوڕی عــامر (ڕەزای خــوای لێبێــت) دەگێڕێتــەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "هەرکەسێك عەیبی کەسێك ببینێـت و پەردەپۆشی بکات، ئەوا وەك ئـەوە وایـە کـە ژیـانی کچێك ڕزگـار بکات کە زیندەبەچاڵ دەکرێت".

ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خواﷺ فەرموویەتی: "هەرکەسێك لە دونیـادا (هەڵـەکانی) بەندەیـەك

پەردەپۆش بکات، ئـەوا بێگومـان خـوای گـەورەش لـەڕۆژی دوایـیـدا (هەڵەکانی) ئەو پەردەپۆش دەکات".

## ئەو لایەنانە چین کە دەبێت لەکاتی هاوڕێ هەڵبژاردندا سەرنجیان بدەین؟

ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خـوای ﷺ فەرموویـەتی:"مـرۆڤ لەسـەر دینـی هاوڕێکەیـەتی. کەواتـە هەریەکێك لەئێوە با سەرنجی ئەوە بدات کە هاوڕێیەتی لەگـەڵ کێـدا دەکات".

ئـەبو موسـا (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خوای ﷺ فەرموویەتی:"نموونـەی هـاوڕێی بـاش و هـاوڕێی خـراپ وەك هـەڵگری میسك و کـوورە دەمـێن وایـە، هـەڵگی میسـك یـان بەشـت دەدات، یان لێی دەکڕیت، یان بۆنێکی خۆش دێت بەسەرتا، کـوورە دەمێنـیش یـان جلـەکانت دەسـوتێنێت یـان بـۆنێکی نـاخۆش دێـت بەسەرتا".[١]

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

## ئەو كارە چیە كە بە ئەندازەی پەرستشە فەرزەكان پاداشتمان پێدەگەیەنێت؟

ئــەبو دەرداء (ڕەزای خــوای لێبێــت) دەگێڕێتــەوە: پێغەمبــەری خواﷺ فەرموویەتی: "دەتانەوێت ئەو شتەتان پێ بڵێم كـە لـە پلـەی نوێژو ڕۆژوو و خێر بەرزترە؟"

وتیان: "بەڵێ! ئەی پێغەمبەری خوا، بیڵێ!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەو شتە ئەوەیە كـە (پەیوەنـدی) نێـوان خەڵك ڕێك بخەیت، چونكە تێكچوونی نێوانی خەڵك دین ناهێڵێت".

## چرووكترین كەس لەنێو مرۆڤەكاندا كێیە؟

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: كاتێـك چـوومە نـاو مزگەوتەكەوە پێغەمبەری خوامﷺ بینی بەتەنیا دانیشتبوو. هەستام و بێ ئەوەی ئەو من ببینێت دەستم كرد بە تەماشاكردنی. لـەناخی خۆمدا وتم هەرگیز پێغەمبەرﷺ بەم شێوەیە بەتەنیا نەماوەتەوە، یا پێویســتیەكی هەیــە یــان بــەهۆی سروشــەوە (وەحــی) بەتــەنیا ماوەتــەوە. پاشــان ویســتم بچــمە خزمــەتی و داوای ئامۆژگــاری لێ بكەم، بەڵام دوودڵ بووم لەوەی كە بچم.

لەکۆتاییــدا چــوومە خزمــەتی، ســەلامم لێ کــردو دانیشــتم. بۆماوەیەکی زۆر دانیشتم بێ ئەوەی پێغەمبەرﷺ ئاوڕم بۆ بداتـەوەو قسەم لەگەڵ بکات. لەدڵی خۆمدا وامزانی کە پێغەمبەری خوا هاتنی منـی پـێ خـۆش نـەبوو. پێغەمبـەرﷺ پێـی فـەرمووم: "ئـەی ئـەبو زەڕ!".

وتم: "فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا!"

فەرمووی: "نوێژی سونەتت کردووە؟"

وتم: "نەخێر!"

فەرمووی: "هەستەو نوێژ بکە".

منیش هەستام و ئەوەنـدەی خـوا پێـی خـۆش بـوو نوێـژم کـردو پاشان گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و دانیشتم. ئەمجارەش بۆ ماوەیەکی درێژخایەن قسەی لەگەڵ نـەکردم. منـیش دیسـان وتم دیارە پێغەمبەرﷺ پێی خۆش نیە کە لێرە دانیشتووم.

پاشان ئاوڕی دایەوەو پێی فـەرمووم: "ئـەی ئـەبو زەڕ! لەشـەڕو خراپەی شەیتانی مرۆڤ و شەیتانی جنۆکەکان، پەنا بەخوا بگرە!"

وتم: "دایکـم و بـاوکم بـە فیـدات بـن ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئایـا شەیتانی مرۆڤیش هەیە؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئایـا خـوای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا نافـــەرمووێت: "پـــەری و مرۆڤـــە شـــەیتانەکان بـــەگوێی یەکـــدا دەچرپێنن".

ئەی ئەبو زەڕ، دەتەوێت وشەیەکت فێر بکەم کە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت؟"

وتم:"دایکم و باوکم بە فیدات بن ئەی پێغەمبەری خوا!"

فەرمووی:"ئەوەیە کە بڵێیت:"لا حَولَ وَلا قُوةَ إلا بِالله".

پاشان ماوەیەکی درێژ تێپەڕبوو هیچ قسەم نەکرد. دیسان ویستم دەست بکەمەوە بە گفتوگۆ کردن و وتم:"ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ فەرمانت پێ کردم کە نوێژ بکەم. ئەمە مانای چی بوو؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەمە خێرێکی زۆر گەورەیە، ئەوەی بیەوێت کەم دەیکات و ئەوەی بیەوێت زۆر دەیکات".

وتم:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ ڕۆژوو چیە؟"

فەرمووی:"فەرزێکە کە خوای گەورە پاداشتی زۆری لەسەر دەدات".

وتم:"ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی صەدەقە چیە؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"خوای گەورە پاداشتی ئەوە بە چەندەها پلە دەداتەوە، لای خوای گەورە لەوە زیاتریش هەیە".

وتم:"باشترین کردەوە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟"

فەرمووی:"باوەڕهێنانە بەخوای گەورە، هەروەها جیهادکردنە لەپێناویدا".

وتم:"ئەی پێغەمبەری خوا، باشترین و بەرزترین شەهید کێیە؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەو کەسەیە کە لەپێناوی خوای گەورەدا خوێنی بڕژێت و بخنکێنرێت".

وتم: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ پلە بەرزترین بەندە کێیە؟"

فەرمووی: "ئەو بەندەیەیە کە نرخەکەی گران بێت و لای خاوەنەکەی بەنرخ بێت".

پرسیم: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ، باشترین خێرو صەدەقە چیە؟"

فەرمووی: "ئەوەیە کە بەڕەنج و ماندوبوون پەیدا دەکرێت و بە شاراوەیی دەدرێت بە هەژار".

وتم: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئەی ئەگەر شتێکم نەبوو بیکەم بەخێر؟"

فەرمووی: "یارمەتی کەسێك بدە کە کار دەکات".

وتم: "ئەی ئەگەر توانام ئەوەندە نەبوو کە یارمەتی بدەم؟".

پێغەمبەری خواﷺ ئامـاژەی بۆ زمـانی کـردوو فـەرمووی: "ئەمـە بپارێزە لە زیان گەیاندن بە خەڵك. ئەوە صەدەقەیەکی جوانە. کە مرۆڤ بەوە صەدەقە بەخۆی دەکات".

پرسیم: "ئەی پێغەمبەری خوا، گەورەترین ئایەت کە بۆت هاتووەتە خوارەوە کامەیە؟"

فەرمووی: "آية الكرسي".

پاشان لێی پرسیم: "ئایا ئەزانی گەورەیی (آیة الكرسي) بەپێی زەوی و ئاسمان چەندێکە؟"

وتم: "نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا! لەوەی خوای گەورە فێری کردوویت منیش فێر بکە".

فەرمووی: گەورەیی ئاسمانەکان و زەوی لەچاو (آیة الكرسي)دا، وەك ئەڵقەیەکە لەناو بیابانێکدا. گەورەیی(آیة الكرسي) لەچاو ئاسمانەکان و زەویدا بەهێندەی گەورەیی بیابانەکەیە لەچاو ئەو ئەڵقەیەدا.

وتم: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ نێردراوەکانی خوا ژمارەیان چەندە؟"

فەرمووی: "صەدو بیست و چوار هەزار".

لێم پرسی: "ئایا هەموویان پێغەمبەر بوون؟"

فەرمووی: "نەخێر! ئەوانەی کە پێغەمبەر بوون ژمارەیان صەدو چواردە کەس بوو".

وتم: "ئەی پێغەمبەری خوا! یەکەمین پێغەمبەر کێ بوو؟"

فەرمووی: "یەکەمین پێغەمبەر حەزرەتی ئادەم بوو. خوای گەورە ئەوی لەخاك بەدیهێناوەو پاشان لەڕۆحی خۆی فووی پێدا کردووەو قسەی لەگەڵ کردووە".

پاشان خەڵك لەدەوری پێغەمبەری خواﷺ کۆبوونەوەو ئەویش فەرمووی: "پێتان بڵێم چروکترین مرۆڤ کێیە؟"

وتم: "بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا!".

فەرمووی: "چروكترین مرۆڤ ئەو كەسەیە كە ناوی من بهێنرێت لەلای و ئەویش دروودم لەسەر نەدات". (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)

## ئایا دەكرێت بە هەر هۆیەك بێت ئاواتەخوازی مەرگ بین؟

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "هیچ كەسێك لە ئێوە بەهۆی زەرەرو زیان و ناخۆشیەك كە تووشی هاتووە با ئاواتەخوازی مەرگ نەبێت. ئەگەر زۆر هەستی بەوە كرد كە دەیەوێت بمرێت، ئەوا با بڵێت: "خوای گەورە، ئەگەر ژیان خێری تێدایە بۆم بمژیەنە و ئەگەر مەرگ خێرترە بۆم ئەوا گیانم بكێشە".[1]

## ئەو پرسیارانە چین كە لە گۆڕدا لێمان دەكرێن؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "مردوو كاتێك دەمرێت دەخرێتە ناو گۆڕەوە،

---

١- هەردوو پێشەوا بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان كردوە.

ئەگەر کەسێکی ساڵح و باش بوو بێت ئەوا بێ ترس و خەم لە گۆڕەکەیدا دادەنیشێنرێت".

پاشان لێی دەپرسێت: "تۆ لەسەر کام ئایین بویت؟"

دەڵێت: "لەسەر ئایینی ئیسلام بووم".

پێی دەوترێت: "ئەم پیاوە کێیە؟"

دەڵێت:"ئەمە پێغەمبەر موحەممەدەﷺ، لە لایەن خوای گەورەوە بەڵگەو دەلیلی ئاشکرای بۆ هێناین، ئێمەش باوەڕمان پێ هێنا".

لێی دەپرسن: "خوای گەورەت بینیوە؟"

دەڵێت:"هیچ کەس ناتوانێت و بۆی نیە خوای گەورە ببینێت".

لە دوای ئەوەوە دەروازەیەکی بۆ جەهەننەم بۆ دەکرێتەوە، تەماشای ئەوێ دەکات و کڵپە کڵپی ئاگرەکە دەبینێت.

پێی دەوترێت:"تەماشای ئەو ئاگرە بکە کە خوای گەورە تۆی لێ پاراستووە!"

پاشان دەروازەیەکی لە بەهەشتەوە بۆ دەکرێتەوەو سەیری ئەو جوانی و ناز و نیعمەتانە دەکات کە تێیدایە.

پێی دەوترێت:"تۆ گومانت نەبوو لە هیچ کام لەم شتانەو یەقینی تەواوت پێی هەبوو".

لەسەر ئەو باوەڕە مردیت و إن شاءالله هەر لەسەر ئەو باوەڕە زیندوو دەکرێیتەوە".

بەڵام ئەگەر مردووەکە کەسێکی خراپ بووبێت، ئەوا بە ترس و خەمێکی زۆر لەناو دڵیدا، لە گۆڕەکەیدا دادەنرێت و لێی دەپرسرێت:"لەسەر کام ئایین بوویت؟"

دەڵێت: "نازانم!"

لێی دەپرسن: "ئەم پیاوە کێیە؟"

دەڵێت: "گوێم لە خەڵك بوو چەند شتێکیان دەگوت، منیش ئەوەم دەگوت".

دەروازەیەکی بەرەو بەهەشت بۆ دەکرێتەوە، تەماشای ئەو جوانی و ناز و نیعمەتە دەکات کە تێیدایە.

پێی دەوترێت: "تەماشای ئەو بەهەشتە بکە کە خوای گەورە تۆی لێ دوور خستۆتەوە".

پاشان دەروازەیەکی بۆ دەکرێتەوە ڕاست بۆ دۆزەخ. تەماشای ئەوێ دەکات و کڵپە کڵپی ئاگرەکە دەبینێت.

پێی دەوترێت:"ئێرە شوێن و جێی تۆیە. تۆ گومانت هەبوو دەربارەی بوونی دۆزەخ و ئینکاریت دەکردو لەسەر ئەو گومانە مردیت و إن شاءالله هەر لەسەر ئەو گومانەشت زیندوو دەکرێیتەوە."

# کەی ڕۆژی دوایی دێت؟

ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: لە یەکێك لە کۆڕو دانیشتنەکانی پێغەمبەرداﷺ کاتێ قسەی بۆ ئامادەبووان دەکرد، یەکێك هات و پرسی:"کەی ڕۆژی دوایی دێت؟"

پێغەمبەرﷺ قسەکانی خۆی نەبڕی و بەردەوامی بە قسەکانی خۆیدا. ئەوانەی لەوێ دانیشتبوون هەندێکیان (لە دڵی خۆیاندا) دەیانوت:"پێغەمبەرﷺ گوێ بیستی پرسیارەکەی ئەو دەشتەکییە بوو، بەڵام خۆشی لە پرسیارەکە نەهاتووە". هەندێکی دیکەشیان دەیانوت: "لەوانەیە گوێی لە پرسیارەکە نەبوو بێت".

پێغەمبەرﷺ کاتێك لە قسەکانی تەواو بوو، فەرمووی: "ئەو کەسەی دەربارەی ڕۆژی دوایی پرسیاری کرد کوا؟"

دەشتەکیەکە وتی:"من بووم، ئەی پێغەمبەری خوا!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"هەرکات ئەمانەت و ڕاسپاردە بزر بوو، ئەوکات چاوەڕێی هەستانی قیامەت بن!"

پیاوەکە پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمانەت چۆن بزر دەبێت؟"

فەرمووی: "هەرکاتێك کارێك بە یەکێ سپێردرا شایەنی ئەو کارە نەبوو چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بە".[1]

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

## له ڕۆژی دواییدا چ ئوممەتێك

## له پێشدا حسابی لەگەڵدا دەكرێت؟

ئـيبن عـەباس (ڕەزای خـوای لێبێـت)دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرموویەتی:"ئێمە دوایین ئوممـەت و یەکـەم ئوممـەتین کـە حسابمان لەگەڵـدا دەکرێـت. لەوێـدا دەوترێـت:"ئوممـەتی ئـوممی و پێغەمبەرەکەیان کوان؟ بزانن، ئێمە دواهەمین و یەکەمینین (واتە لە دونیادا دوایین ئوممەتین و لە ڕۆژی دواییشـدا یەکـەم ئوممـەتین کـە حسابمان لەگەڵدا دەکرێت)". [1]

## ئەو كەسانە كێن كە لە ڕۆژی دواییدا

## خوای گەورە سەیری ڕووخساریان ناكات؟

ئەبو هـورەیرە(ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی:"سێ کـەس هـەن، خـوای گـەورە لـە ڕۆژی دواییـدا نـە قسەیان لەگەڵدا دەکات، نە تەماشایان دەکات و نە تاوانەکانیشـیان پاك دەکاتەوە، ئەوانە سزایەکی بە ئازارو سەخت چاوەڕێیانە:

–کەسێك کە لە بیابان و چۆڵەوانیدا ئاوی زیادەی پێ بێت و لـەو ئاوە بەشی ڕێبوار نەدات. ئەو کەسە لە ڕۆژی دواییدا خـوای گـەورە

---

١– پێشەوا ئەبوداود ڕیوایەتی کردوە.

پێی دەفەرمووێت: ئەمڕۆ منیش تۆ لە لوتف و فەزڵی خۆم بێبەش دەکەم، هەروەك چۆن لە (دونیادا) خەڵکت بێبەش کردبوو لەو شتەی کە لە دەستتدا بوو".

– کەسێك کە شتێك بفرۆشێت و لای کڕیارەکان سوێند بە خوای گەورە بخوات و بڵێت ئەمەم بەوەندەو بەوەندە کڕیوە بە درۆو وا لە بەرامبەرەکەی بکات و بەم شێوەیە شتەکەی بفرۆشێت.

– کەسێك کە بە تەنها لەبەر سوودێکی دونیایی بەیعەت بە ئیمام بدات، بە جۆرێك ئەگەر ئیمامەکە ئەو شتە دونیاییانەی بداتێ کە ئەیەوێت لە بەیعەتەکەیدا ڕاستگۆیە و ئەگەر نەیداتێ ڕاستگۆ نیە !"[1]

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"سێ کەس هەن خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا نە دەیاندوێنێت و نە تەماشای ڕووخساریان دەکات و نە گوناهەکانیشیان دەسڕێتەوە. ئەو کەسانە سزاو ئەشکەنجەیەکی سەخت چاوەڕێیانە ! "

پێغەمبەرﷺ ئەمەی سێ جار دووبارە کردەوە.

من وتم:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ ! کەواتە ئەو کەسانە تووشی زەرەرو لەدەست چوونێکی گەورە هاتوون. ئەوانە کێن؟"

---

١– هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.

پێغەمبەرﷺ بەم شێوەیە بۆی ژماردم:

– کەسێك کە بە فیزو خۆ بەزل زانیەوە پۆشاکەکەی درێژ بکات و لە زەوی بخشێت، کەسێك کە کردەوە چاکەکانی بداتەوە لەڕووی خەڵك. هەروەها کەسێك کە بە سوێندی درۆ هەوڵی فرۆشتنی کاڵاکانی بدات!"[1]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە:"پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:"سێ کەس خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا نە دەیاندوێنێت. نە تەماشایان دەکات و نە تاوانەکانیان دەسڕێتەوە. ئەو کەسانە تووشی سزاو ئەشکەنجەیەکی سەخت دەبن:

– پیرێکی زیناکار.

– سەرکردەیەکی درۆزن.

– هەژارێکی خۆبەزلزان.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە:"پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:"سێ کەس هەن لەڕۆژی دواییدا خوای گەورە تەماشایان ناکات: کەسێك کە مافی دایك و باوکی نەپارێزێت، ئافرەتێك کە خۆی بکات بە کوڕ، هەروەها کەسێك دەلاڵی بکات لەکاری خراپەدا".[2]

---

١– پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

٢– پێشەوا نەسائی ڕیوایەتی کردوە.

## ئەو نزایە کامەیە کە مرۆڤ لە قەرزاری و ناخۆشیەکان دەرباز دەکات؟

سەروەرمان ﷺ فەرموویەتی: "ئەی موعاذ، چەند وتەیەکت فێر بکەم کە ئەگەر بیڵێیت خوای گەورە قەرزەکانت لەسەر لاببات تەنانەت ئەگەر بەقەدەر شاخێکیش بن هەروەها هەموو ناخۆشیەکانت وەلابنێیت؟"

"اللهُمَّ مالكَ المُلكِ تؤتي المُلكَ من تشاء وتنزِعُ المُلكَ ممَّنْ تَشاء وتُعِز مَن تشاء وتُذِلُ مَنْ تَشاء، بيَدِكَ الخَيرِ إنَكَ على كُلٍّ شيءٍ قدير. تُلِجُ الليلَ في النَهار وتُلِجُ النَهارَ في الليل، تُخرِجُ الحَيَّ مِنَ المَيّت وتُخرِجُ المَيتَ من الحيَّ. رحمنُ الدنيا والآخرةِ تعطيها من تشاء وتمنع عنهما من تشاء. إرحمني رحمةً بها يغنيني عن رحمة من سواك".

## ئەو نزایە کامەیە کە حەزرەتی جوبرەئیل کردی و پێغەمبەرﷺ سێ جار وتی ئامین؟

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: "کاتێک پێغەمبەرﷺ چووە سەر مینبەرەکە لەیەکەم پلیکانەدا فەرمووی: "ئامین!". پاشان چووە سەر دووەم پلیکانەو فەرمووی: "ئامین!". دوای ئەوە لەسەر سێیەم پلیکانەش فەرمووی: "ئامین!" پاشان چووە سەر

مینبەرەکە دانیشت. هاوەڵەکانی پێیان وت:"پێغەمبەری خواﷺ بۆچی فەرمووت ئامین؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) هاتە خزمەتم و فەرمووی:" لووتی بدا لە زەوی ئەو کەسەی دایك و باوکی یان یەکێکیان لە ژیاندابن و نەچێتە بەهەشتەوە (واتە ئەوەندە خزمەتی نەکردوون تا خوا لێی خۆش بێت)، بڵێ ئامین، منیش وتم ئامین!، پاشان فەرمووی: لووتی بدا لە زەوی ئەو کەسەی دەگات بە ڕەمەزان و لێخۆش بوونی خوای گەورە بەدەست ناهێنێت بۆ خۆی، بڵێ ئامین، منیش وتم: ئامین!، پاشان فەرمووی: لوتی بدا لە زەوی ئەو کەسەی باسی تۆی لەلا کراو دروودی لەسەر نەهێنایت، بڵێ ئامین، منیش وتم: ئامین!".

## ئایا موسوڵمانی گوناهبار بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە؟

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) وتویەتی:"پێغەمبەری موکەرەمﷺ فەرموویەتی:"دوای ئەوەی ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ دەچنە ئاگری دۆزەخەوە، خوای گەورە (عزوجل) فەرمان دەدات و

دەفەرمووێت:"هەرکەسێك بە ئەندازەی کێشی دانە خەرتەلەیەك باوەڕ لەدڵیدا هەیە (لەئاگری دۆزەخ) دەری بهێنن".

ئەمانە دوای ئەوە بەپاکی و سپێتی (بێ گوناه) لە ئاگری دۆزەخ دەردەهێنرێن و دەخرێنە ڕووباری حەیاتەوە وە (لەوێدا) وەك چۆن ئەو تۆوی ڕێحانە کێوییانەی لەگەڵ لافاو هاتوون ئەڕوێن ئەوانیش ئاوا ئەڕوێن، نابینیت چەندە جوان لقەکانیان بە هەردوو لادا بڵاوکردوەتەوە؟[1]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە: پێغەمبەری ئازیزﷺ فەرموویەتی:"هەرکەسێك بڵێت "لا إله إلا الله" و بەئەندازەی قورسایی دەنکە جۆیەك خێر (واتە باوەڕ) لە دڵیدا هەبێت ئەوا لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە.

هەرکەسێك بڵێت:"لا إله إلا الله" و بەئەندازەی کێشی دەنکە گەنمێك خێر (واتە باوەڕ) لە دڵیدا هەبێت، لەئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە.

هەرکەسێك بڵێت:"لا إله إلا الله" و بەئەندازەی کێشی زەڕڕەیەك خێر (واتە ئیمان) لە دڵیدا هەبێت، لەئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە.

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

## له ڕۆژی دواییدا

## کێ بەر شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ دەکەوێت؟

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: "جارێکیان لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسی: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ لەڕۆژی دواییدا کێ لە هەموو کەس زیاتر بەر شەفاعەت و لێخۆشبوونی تۆ دەکەوێت؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەی ئەبو هورەیرە، لەڕۆژی دواییدا لەنێو هەموو خەڵکدا، لە هەموو کەس زیاتر ئەو کەسەی بەر شەفاعەتی من دەکەوێت ئەو کەسەیە کە لە دڵیەوە وتبێتی "لا إله إلا الله".

## ئاگری دۆزەخ لەکێ حەرام کراوە؟

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە: موعاذی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەر وشترێك لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ دەڕۆیشت. پێغەمبەرﷺ بانگی کردو فەرمووی: "ئەی موعاذ!".

موعاذ وتی: "بەڵێ! ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمرم پێ بکە!".

ئەمە سێ جار دووبارە بوویەوە، لەسێیەم جاردا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هیچ کەسێك نیە کە لەناخی دڵیەوە شەهادەتی ئەوە

بێنێت كە جگە لە (الله) هیچ خوایەكی دیكە نیە و (محمد) یش نێردراوو پێغەمبەری ئەوە، كە خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لێ حەرام نەكات".

موعاذ وتی:"ئەی پێغەمبەری خوا پێت خۆشە ئەمە بە خەڵك ڕابگەیەنم؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"نەخێر، چونكە ئیتر پشت بەوە دەبەستن".

(مەبەستی ئەوە بووە كە ئیتر خێرو چاكە زۆر ناكەن و تەنها پشت بەوە دەبەستن)

موعاذی كوڕی جەبەل تا نزیك وەفاتی ئەمەی لای خۆی هێشتەوە، پاشان لە ترسی ئەوەی ئەمە تەنها لای خۆی بمێنێت، بۆ خەڵكی باس كرد.

## پێناسەی پێغەمبەرﷺ بۆ كەسی هەژار چیە؟

لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ لە مەدینە، ئیسلامەتی فێری هەموو كەسێكی گەورەو بچووك دەكرا، هەركەسێك بهاتایەتە ناو مزگەوتەوە جگە بۆ خێر یان بۆ فێربوونی شتێكی باش یان فێركردنی شتێكی باشتر، بۆ شتێكی دیكە نەدەهاتن.

هاوەڵانی (صُفّة)، خوێندكاری بەردەوامی مزگەوتەكە بوون. پێش ئەوەی ئاوڕ بدەیتەوە بۆ لای قیبلەی كەعبە، لەلای باكوری

مزگەوتەکەدا بە پەلکی دارخورما بەرسێبەرێك دروست کرابوو. ئەو هاوەڵانەی کە لەمەدینەدا هۆزو تیرەو ماڵو خانوویان نەدۆزیایەتەوە، ئەوا لەوێدا دادەنیشتن و پێیان دەوترا هاوەڵانی (صُفّة) هاوەڵانی (صفة) ژمارەیان لە هەشتا کەس زیاتر بوو. ئەگەر کەسێ: لەناویاندا ژیانی هاوسەرگیری پێکبهێنایە، بمردایە یان سەفەری بکردایە ئەوا ژمارەیان کەم دەبوویەوە.

هاوەڵانی (صُفّة) شەوانیان بە نوێژکردن و قورئان خوێندن و دەرس خوێندن بەسەر دەبرد، بەڕۆژیش ئاویان دەگواستەوەو داریان کۆدەکردەوەو دەیانفرۆشت و خۆراکی خۆیان پێ دەکڕی.

هەندێ شەو هاوەڵانی (صفة)، لەپڕ هەر هەشتاکەیان لە دەوری مامۆستایەك کۆدەبوونەوەو تا بەیانی وانەیان دەخوێند، هاوەڵانی صفە پێیان دەوترا (قُراء) واتە قورئان خوێنەکان. کاتێك کەسێك بۆ فێرکردنی قورئان و سوننەت دەنێردرا بۆ هۆزەکان ئەوا لەوان هەڵدەبژێردراو دەنێردرا.

پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە خاوەن خورماکان کردبوو کە لەکاتی خورما کۆکردنەوە لەدارەکانیاندا لە هەر دە بارێك هێشوویەك خورما ببرێت بۆ مزگەوت بۆ هاوەڵانی (صفة).

هاوەڵانی (صفە) لە کۆمەڵەی ئەو هەژارە ڕاستەقینانە بوون کە ساڵ بۆ ساڵ زەکات و خێری موسوڵمانانیان پێ دەدرا.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "هەژاری ڕاستەقینە ئەو کەسە نییە کە ماڵەو ماڵ دەگەڕێت و بە یەك دوو پاروو یان خورمایەکەوە دەگەڕێتەوە. هەژاری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە ئەوەندە پارەی نیە پێداویستی خۆی پێ دابین بکات و سەرەڕای ئەوەش شەرم دەکات سواڵ بکات و بەوە نازانێت کە پێویستی بە خێرو صەدەقەیە".

## ئەو لایەنانە چین کە دەبێت لەکاتی بازرگانیدا ئاگاداریان بین؟

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: "ئەو بازرگانانەی کە سەر ڕاست و دەست پاکن (کە لە ئایەتەکەدا بە هاوەڵانی سەر ڕێی ڕاست – صراط المستقیم– ناوبراون) لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و ساڵحەکان و شەهیدەکاندان".

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: گوێ بیستی پێغەمبەرﷺ بووم فەرمووی: "بازرگانان پێیان وایە کە بەسوێند خواردنی درۆ لە بازرگانیدا سامانەکانیان زیاد دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا قازانجەکەیان ناهێڵێت".

ڕیفاعـەی کـوڕی ڕافیـع دەڵێـت: لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ چووبووینە دەرەوەو بەیەکەوە دەڕۆیشتین. بینیمـان خـەڵك بـەیانی زوو کـڕین و فرۆشـتنیان دەکـرد! پێغەمبـەر ﷺ بـانگی کـردن و فەرمووی: "ئەی کۆمەڵی بازرگانان!"

ئـەوانیش سـەریان بـەرزکردەوەو سـەیری پێغەمبـەریان کـرد ﷺ فـەرمووی: "گومـان لـەوەدا نیـە کـە بازرگانـان لـەڕۆژی دواییـدا بـە خراپـەکاری زینـدوو دەکرێنـەوە. تـەنها ئەوانـە نـەبێت کـە لـەخوا دەترسـن و بەسـوێندەکانیانەوە پابەنـد دەبـن و لـە قسـەکانیاندا ڕاستگۆن".

بـەپێی ئـەوەی ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) پێـی ڕاگەیاندوین:

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای گەنم فرۆشێك و دەستی کرد بـەناو گەنمەکەدا، کاتێ هەستی کرد پەنجەکانی شێی تەڕییان بەرکەوتوە، فەرمووی: "ئەی فرۆشیار! ئەوە چییە؟".

کابرای فرۆشیار وتی: "پێغەمبەری خوا باران لێی داوە."

پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: "بۆچـی ئـەو بەشـە تـەڕبووەیت نەخستووەتە سـەرەوە تـا خـەڵك ببینـن؟ کەسێك کـە فێـڵ بکـات لەئێمە نیە!".

پێغەمبەر ﷺ ئەو کەل وپەلانـەی کـە لـەبازاڕدا دەفرۆشـرێن پـێش هێنانیان بۆ بـازاڕو لەڕێگـەدا تێکـەڵ کردنیـان، فرۆشـتنی خـۆراك و

هـەموو شـتێکی دیکـە پـێش تـەواو وەرگرتنـی، فرۆشـتنی مـاڵ و سامانێك لەبازاڕدا کە لە دەستدا نەبێت و فرۆشتن بەسـەر فرۆشـتنی یەکترەوەو تووڕەکردنی کڕیاری قەدەغە کردوە.

"خوای گەورە ڕەحم بکات بەو بەندەیەی کـە لـەکاتی فرۆشـتندا ئاسـانکاری نیشـان دەدات و بـەو بەندەیـەی کـە لـەکاتی کڕینـدا ئاسانکاری نیشان دەدات و هـەروەها بـەو بەندەیـەی کـە لەکاتێکدا داوای مافی خۆی دەکات ئاسانکاری نیشان دەدات".

خوای گەورە لێبوردەیی لە فرۆشـتندا، لێبـوردەیی لە کڕیندا و، لێبوردەیی لە پارەپێداندا پێ خۆشە.[1]

## پێغەمبەرﷺ لە بابەتی دەستەبەرکردنی دادپەروەریدا چ ئامۆژگارییەکی کردووین؟

بەپێی ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆز، پێغەمبەرﷺ لەمەدینەدا هەر داواو ناکۆکییەك دەهێنرایە خزمەتی چ لەلایـەن موسـوڵمانانەوە بوایەو چ لەلایەن نـا موسـوڵمانانەوە بووایـە، ئـەو بـە دادپـەروەرانـە چارەسـەری دەکـرد. ئـەم بابەتـە بـۆ هـەموو خـەڵکی مەدینـە لـە

١- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

موسـولْمان و موشـريك و يەهوديـەكان لەسـەر كارنامـەی مەدينـە نووسرابوو و پەسەند كرابوو.

بوونە حاكم هەرچەندە كارێكی شـەرەفمەندانەيە بـەڵام بەهـەمان ئەندازەش ئەركێكی قورس و گرانەو هەڵگرتنی بەرپرسياريەتييەكی گەورەيە.

پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەم بابەتە فەرموويەتی:"حاكمـەكان دابـەش دەكرێن بۆ سێ جۆر، يەكێكيان لە بەهەشتدايە (واتـە ئـەو كەسـەيە حـەق دەزانێـت و بـەپێی ئـەوە حـوكم دەدات لەبەهەشـتدايە)، دووەميـان لـە دۆزەخدايـە (واتـە حـەق دەزانێـت، بـەڵام لـە حـوكم دانەكەيـدا زوڵـم دەكـات و ناهـەقی ئـەنجام دەدات دەچـێتە دۆزەخەوە)، سێيەميشيان ئەو كەسـەيە كـە حـەق نازانێـت و لـەناو خەڵكدا حوكم دەدات دەچێتە دۆزەخەوە!".

-"حاكم تا ڕەچاوی دادپەروەری و يەكسانی بكات، گومانی تێدا نيە كە خوای گەورە لەگەڵيدايە، بەڵام هەر ئەوەنـدە بـەلای ناهەقـدا لايدا، خوای گەورە بەتەنها جێی دەهێڵێت".

-"كاتێـك حـاكم حـوكم دەدات، ئيجتيهـاد دەكـات، ئەگـەر لـە ئيجتيهـاد كردنەكەيـدا ڕاسـتييەكە بپێكێـت ئـەوا دوو پاداشـتی بـۆ دەنووسرێت، بەڵام كاتێك حوكم دەدات لە ئيجتيهاد كردنەكەيدا بـە هەڵەدا بچێت، ئەوا تـەنها يەك پاداشتی بۆ دەنووسرێت".

پێغەمبەرﷺ ئەوەی لەبەرچاو گرتووە کە کەسی تووڕە لەکاتی حوکم داندا بۆ ساتێك ئەگەری ئەوەی هەیە لە دادپەروەری و یەکسانی لابدات، بۆیە فەرموویەتی:

-" با هیچ کەسێك لەکاتی تووڕەیدا حوکم نەدات لەنێوان دوو کەسدا".

-" هەریەکێك لەئێوە کاتێك دەربارەی موسوڵمانان حوکمی دا، با لەکاتی تووڕەبووندا حوکم نەدات. با دڵنیا بێت لەوەی کە بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات لە تەماشاکردنیان و شوێنی دانیشاندنیان و ئیشارەت بۆ کردنیاندا".

پێغەمبەرﷺ کاتێك حوکمی دەدا، داواکارو داوا لەسەر کراوی لەبەردەمی خۆیدا دادەنیشاند.

کاتێك سەروەرمانﷺ حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) وەك دادوەر نارد بۆ یەمەن، ئەم ئامۆژگاریەی کرد: "کاتێك حوکم دەدەیت لەنێوان دوو کەسدا، تا گوێ لەوی تریشیان نەگریت حوکم نەدەیت. ئەگەر گوێ لە هەردووکیان بگریت ئەوا بۆت ئاشکرا دەبێت چۆن حوکم بدەیت لەنێوانیاندا".

پێغەمبەرﷺ دەربارەی مافی خەڵك زۆر بە وردی و هەستیاری مامەڵەی دەکرد، کاتێك حوکمی دەدا بەردەوام لە خەمی ئەوەدا بوو کە بڕیارێکی هەڵە بدرێت و بەهیچ جۆرێك لای خوای گەورە قەرەبوو نەکرێتەوە. بۆیە ڕۆژێکیان ئەم ئاگادارکردنەوەیەی فەرموو:

-"منیش لە کۆتاییدا هەروەك ئێوە مرۆڤم. ئێوە داواکانتان دەهێنن بۆ لای من. هەندێ جار ئەوە ڕوودەدات کە یەکێکتان بەڵگەو بیانووەکانی لەوی ترتان بەهێزترەو جوانتر ڕوونی دەکاتەوە، منیش بەوەی کە لە ئێوەوە دەبیستم حوکم دەدەم. لەبەرئەوە هەرکاتێك من بەم شێوەیە مافی برا موسوڵمانەکەتان بدەم بە ئێوە، ئەوا یەکسەر بیگەڕێننەوە. چونکە ئەگەر مافی خۆتان نەبێت ئەوە وەك ئەوە وایە پارچەیەك لە ئاگری دۆزەخم پێدا بێت".

جارێکیان دوو پیاو هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ ، یەکێکیان لە (حضر موت) ئەوی تریان لە (کیندە) وە هاتبوونە خزمەتی دەربارەی پارچە زەوییەك لە یەمەن.

ئەوەیان کە لە (حضر موت)ەوە هاتبوو وتی:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ ! ئەم پیاوەو باوکی دەستیان گرتووە بەسەر پارچە زەوییەکی مندا کە لەباوکمەوە بۆم ماوەتەوە".

ئەوەشیان کە لە (کیندە)وە هاتبوو وتی:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەو پارچە زەوییە لە باوکمەوە بە میراتی بۆم مابووەوە، من لەوێدا کشتیاری دەکەم و دروێنەی دەکەم، ئەو هیچ مافێکی لەو شوێنەدا نیە!".

ئەوەی (حضر موت)یش دەیوت:" کە باوکی ئەم پیاوە دەستی بەسەر ئەم زەویەی ئەودا گرتووەو ئەم پیاوە خۆیشی ئاگادارە".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"تۆ هیچ بەڵگەیەکت هەیە کە بیسەلمێنیت ئەو زەویانە هی تۆن؟"

پیاوەکەی خەڵکی (حضر موت) وتی:"نەخێر!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"کەواتە دەبێت ئەو سوێند بخوا، هەر ئەو چارەسەرەت هەیە!".

پیاوەکە وتی:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەم کەسە بێباوەڕە، هیچ سڵ ناکاتەوە لەوەی سوێند بخوات، لە هیچ تاوانێکیش ناترسێت".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەو جگە لەوەی سوێندت بۆ بخوات، هیچ شتێکی دیکە نیە بۆتی بکات".

پیاوەکەی خەڵکی کیندە ئامادەبوو بۆ سوێند خواردن.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەگەر ئەم پیاوە لەڕاستیدا بۆ خواردنی ماڵی ئەو سوێند بخوات، ئەوا بێگومان تووڕەیی خوای گەورە دەیگرێتەوەو بەو شێوەیە دەچێتەوە خزمەت خوای گەورە".

دوای ئەوە پیاوە (کیندە)ییەکە وتی:"ئەو زەویە هی ئەوو باوکیەتی".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەو کەسەی بە خواردنی سوێندێکی درۆ مافی موسوڵمانێك زەوت بکات، ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام دەکات و ئاگری دۆزەخ لەسەری واجب دەکات".

وتیـان:"ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ، ئەگـەر تەنانـەت شـتێکی بچووکیش بێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

"تەنانـەت ئەگـەر هێنـدەی چـڵێکی داری ئـاراك (سـیواك) یـش بێت".

"تەنانـەت ئەگـەر هێنـدەی چـڵێکی داری ئـاراك (سـیواك) یـش بێت".

"تەنانـەت ئەگـەر هێنـدەی چـڵێکی داری ئـاراك (سـیواك) یـش بێت".

## هۆکارەکانی باران نەبارین چین؟

هـەرکاتێك خراپـەکاری لەسـەر زەوی بڵاوبوویـەوە، ئـەوا زەمـین لەرزە زۆر دەبێت. کاتێك وڵات بەڕێوەبەرەکان زوڵم لە خەڵك دەکەن و ناهـەقیان بەرامبـەر ئـەنجام دەدەن بـاران نابارێـت، (واتـە وشکەساڵی و قات و قڕی بڵاودەبێتەوە). کـاتێکیش هەرکەسێك کـە لەناو موسـوڵمانانـدا بـژی و هاوپـەیمانی و بەڵێننامـە لەگـەڵ غـەیری موسوڵمانـاندا ببەستێت ئەوا تەنانـەت ئەگـەر پەیمانەکـە جێبـەجێش نەکات، دوژمن بەسەر موسوڵمانـاندا سەردەکەوێت.

# پێغەمبەرﷺ چی فەرمووە دەربارەی فەزڵ و گرنگی حەج؟

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خوامﷺ پرسی: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ دەبینین جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورەدا لە هەموو کردەوەکانی دیکە باشترو خێرترە، ئایا ئێمەش جیهاد بکەین؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "بەڵام لە جیهاد باشترو جوانتر حەج کردنی ماڵی خوایەو، دوای ئەویش مانەوە لە مەدینەدا".

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: "دوای ئەوەی ئەوەم بیست هەرگیز وازم لە حەج کردن نەهێنا".[١]

سوهەیلی کوڕی سەعید (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "هیچ موسوڵمانێك نیە کە (تەلبیە)[٢] بکات و هەموو دارو درەخت و بەردو خاکی ڕاست و چەپی پێکەوە (تەلبیە)ی لەگەڵدا نەکەن، ئەم بەشداری کردنە (ڕاست و چەپی خۆی نیشان دا) بە ئەم لاو ئەولاش دا تا دوا سنوری زەوی بەردەوام دەبێت".[٣]

---

١- پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردوە.

٢- بەمانای (لَبیك) دێت.

٣- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "نێوانی حەج و عەمرە یەك بخەن. چونکە ئەو دووانە هەروەك چۆن هەواکێش پیسی ئاسن پاکدەکاتەوە، گوناهەکانتان پاك دەکەنەوە".[1]

ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

-"هەرکەسێك پەنجا کەڕەت بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا تەواف بکات ئەوا لە گوناهەکانی پاك دەبێتەوە هەروەك ئەو ڕۆژەی لێ دێتەوە کە لە دایك بووە".[2]

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و پرسی:"ئەی پێغەمبەری خوا، کێ لە هەموو کەس زیاتر شایستەی ئەوەیە چاکەکاربم لەگەڵیدا؟" پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"دایکت!" پیاوەکە پرسی"پاشان کێ؟" فەرمووی:"دایکت!" پیاوەکە وتی:"کێی تر؟" پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"دایکت!" پیاوەکە پرسی:"پاشان کێی تر ئەی پێغەمبەری خوا؟" پێغەمبەر فەرمووی:"باوکت!"[3]

---

١- هەردوو پێشەوا ئیبن ماجە و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە.

٢- پێشەوا ترمزی ڕیوایەتی کردوە.

٣- پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

# وتاری ماڵئاوایی پێغەمبەرﷺ

پێغەمبـەری ئازیزمـانﷺ لـە حـەجی ماڵئـاوایی دا لـە (٩) ی ذي الحجة دا ڕۆژی جومعە دوای خۆرهەڵاتن لەسەر وشترەکەی (قصواء) چـووە عەرەفـەو لـەوێ (١٢٤) هـەزار موسـوڵمانی بـە دەوردا بـوو، وتارێکی بۆ دان و ئەم وتە بەنرخەی خوێندەوە:

بسم الله الرحمن الرحيم

"سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و میهرەبان. داوای یارمەتی هەر لـەو دەکـەین. هەرکەسێك خـوای گـەورە هیدایـەتی بـدات ئـیتر کەس ناتوانێ لە ڕێ ی ڕاست لای بدات و ئەوەی کە گـومڕاش بـووە کەس ناتوانێت هیدایەتی بـدات. شـایەتی دەدەم کـە جگـە لـە (الله) هیچ خوایەکی دیکە نیە، تاك و تەنیایەو هاوبەش و هاوتاو لێکچووی نیە".

شایەتیش دەدەم کە (محمد) بەندەو پێغەمبەری ئەوە".

پاشـان فـەرمووی: "خەڵکینـە،باش گـوێم بـۆ بگـرن، چـونکە لەوانەیە ساڵێکی تر لەم شوێنە پیرۆزەدا هەرگیز نەتانبینمەوە".

خەڵکینە!

خوێن و ماڵ و سامانتان لەیەکتری حەرامـە، وەکـو حـەرامی ئـەم ڕۆژەتان، لەم مانگەتاندا و لەم شوێنەتاندا.

ڕۆژێــك دەگەنـــەوە بـــە پـــەروەردگاری خۆتـــان، لـــەبارەی کردەوەکانتانەوە پرسیارتان لێ دەکات، نەکەن لەدوای من گومڕا ببنەوەو بدەن لە ملی یەکتری.

خەڵکینــە، ئــەو کەســەی ئامادەیــەو گــوێی لــە قســەکانمانە بیگەیەنێت بەو کەسەی کە لێرە نیە، لەوانەیە پێڕاگەیەنراوێك هۆشیارتر بێت لە گوێگرێك.

هاوەڵانم!

هەرکەسێك ئەمانەتێکی لایە با بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی. نە زوڵم بکەن و نە بهێڵن زوڵمتان لێ بکرێت. هەموو کارێکی جاهیلیەت دەخەمە ژێر پێمەوە، خوێنە ڕژاوەکانی سەردەمی جاهیلیەت مافی داواکردنیان نیە، یەکەم خوێنێك کە ئەو مافەی لێ دەسەنمەوە، خوێنی ئیبن ڕەبیعەی کوڕی حارثە– کە شیرەخۆری (بەنی سەعد) بوو (هنیل) کوشتی، سووی جاهیلیەت ناهەقە، یەکەم سوویەکیش کە بە ناهەقی دادەنێم، سووی (عەباس)ی کوڕی (عەبدولموتەلیبە)، ئەمانە هەمووی ناهەقن.

هاوەڵانم!

ئاگاتان لە ژنان بێت و لەخوا بترسن، ئێوە بە پەنادانی خودایی ئەوانتان کردووە بە حەڵاڵی خۆتان، بە وتەیەکی خوایی داوێنیانتان ڕەوا کردووە، ئێوە مافتان هەیە بەسەر ئەوانەوە و ئەوانیش مافیان

هەیە بەسەر ئێوەوە. مافی ئێوە بەسەریانەوە ئەوەیە کە ناموستان بپارێزن و ڕێگە نەدەن کەسێك بێتە ماڵەکەتانەوەو نەیهێننە سەر جێگەیان، ئێوە کە پێتان خۆش نیە، ئەگەر وایانکرد بە لێدانێك کە برینداری نەکات لێیان بدەن. وە مافی ئەوانە بەسەر ئێوەوە کە ڕۆزی و کاڵایان بۆ دابین بکەن.

شتێکم لەناوتاندا بەجێهێشتووە، ئەگەر دەستی پێوە بگرن سەرتان لێ ناشێوێت، ئەویش پەڕاوی خوا (قورئان)و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی.

خەڵکینە!

ڕۆژگار وەرچەرخاوەتەوە وەکو ئەو ڕۆژەی خوای مەزن ئاسمان و زەمینی بەدیهێنا، ساڵ دوانزە مانگە، چواریان حەرامن. سیان لەو چوارە بەدوای یەکدا دێن (ذوالقعدة)و (ذوالحجة)و (محرم)و (رجب)یش دەکەوێتە نێوان (جمادی دووەم) و (شعبان)ەوە.

هاوەڵان!

بزانن کە شەیتان تازە لەوە نائومێد بووە کە ئەم بتانە لە وڵاتی ئێوەدا بپەرسترێن، بەڵام دەشێت کە ئێوە لە هەندێ کاردا کە بەکەمی دەزانن بەگوێی ئەو بکەن، ئەویش پێی ڕازی دەبێت. بۆئەوەی دینی خۆتان بپارێزن خۆتان لەوانەش بەدووربگرن.

موسوڵمانان!

باش گوێ لە وتەکانم بگرن، جوان لێی تێ بگەن. خوای ئێوە تاك و تەنهایە، هەمووتان، باوکتان یەکێکە. هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لەخۆڵ دروست کراوە. هیچ کەسێك لە کەسێکی دیکەتان پایەدارو بەرزتر نیە، تەنها بە تەقواو ئیمان نەبێت. موسوڵمان برای موسوڵمانە. بۆیە هەموو موسوڵمانان بران. هەرکەسێك خۆی شتێکت نەداتێ بەڕازی بوونی خۆی، ئەوا حەڵاڵ نیە بیبەیت.

هاوەڵان!

زوڵم لە نەفسی خۆتان مەکەن. نەفسیشتان مافی هەیە بەسەرتانەوە. ئەوانەی لێرە گوێ بیستی ئەم ئامۆژگاریانەمن با بەوانەی ڕابگەینن کە لێرە نین.

خەڵکینە!

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا مافی داوە بە هەموو خاوەن مافێك پێویست ناکات بە جیا وەسیەت بۆ میراتگر بکرێت. هەرکەسێك لەسەر بەڕەی کێ لە دایك بوو بێت ئەوا سەر بەوە. ئەوەی داوێن پیسی ئەنجام دابێت بێ بەش دەبێت. هەرکەسێك ڕەچەڵەکی خۆی بکاتە یەکێکی دیکە جگە لە باوکی و هەر سپڵەیەکیش لایەنگریی خۆی بۆ کەسێکی دیکە جگە لە گەورەکەی ڕابگەیەنێت، ئەوا تووڕەبوونی خوای گەورەو نەفرەتی فریشتەکان و

دوعای (شەڕی) خەڵکی بەسەردا ببارێت. ئەم جۆرە کەسانە خوای گەورە نە تەوبەیان لێ قبوڵ دەکات و نە عەدالەت و شایەتیان لێ وەردەگرێت.

خەڵکینە!

دوای من پێغەمبەری تر نایەت، دوای ئێوەش ئوممەتێکی تر نیە، پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، پێنج نوێژەکەتان بکەن، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن، زەکاتی ماڵ و سامان بدەن، بە حەزی دڵتان بیدەن، حەجی ماڵی خوا بکەن، بە گوێی فەرمانڕەواکانتان بکەن، ئەوسا دەچنە بەهەشتی پەروەردگارتانەوە.

خەڵکینە!

سبەینێ دەربارەی من پرسیارتان لێ دەکرێت، ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان:"دەڵێین شایەتی دەدەین کە تۆ پەیامت گەیاندو بە ئەرکی خۆت هەستاویت و ئامۆژگاریت کردین".

ئینجا پێغەمبەری خواﷺ پەنجەی پیرۆزی شایەتومانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و نزمی کردەوە بۆ زەوی و فەرمووی:

خوایە شایەتی بفەرموو!

خوایە شایەتی بفەرموو!

خوایە شایەتی بفەرموو!

هەرکەسێك لەبەر خاتری خوای گەورە یەك پلە بێفیزی و خاکیبوون نیشان بدات، ئەوا خوای گەورە بەم هۆیەوە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە.

هەرکەسێکیش یەك پلە خۆبەزلزانی نیشان بدات ئەوا خوای گەورە بەهۆی ئەو خۆبەزلزانیەیەوە پلەیەك نزمی دەکاتەوە، تا بەم شێوەیە دەیخاتە (اسفل السافلین)ەوە.[١]

---

١- هەردوو پێشەوا موسلیم و بوخاری ڕیوایەتیان کردووە.

# وەفاتی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ

ئێستاش لە مێژووی ئیسلامدا با بچینە ئەو سەردەمە پڕ خەم و خەفەتەی کە لە نووسراوێکی (عاصم کۆکسالٚ)ەوە وەرمان گرتووە لە کتێبی (مێژووی ئیسلام)دا. ئەویش نەخۆش کەوتنی خۆشەویست و سەروەرو ئازیزی دڵی هەموو موسوڵمانانە، سەردەمی نەخۆش کەوتنی پێغەمبەرﷺ:

پێغەمبەرﷺ هەر لەدوای دابەزینی سورەتی (النصر)ەوە زانی کە وەفاتی نزیك بووەتەوەو بەردەوام تەسبیحات و شوکرو داوای لێ خۆش بوونی لە خوای گەورە دەکردو دەیفەرموو:"

-"پەروەردگارم! من تەسبیحی تۆ دەکەم و سوپاس و ستایشت دەکەم! پەروەردگارم بمبەخشە! گومان لەوەدا نیە کە تۆ لەهەموو کەس زیاتر لە گوناه خۆش دەبیت و بەسۆزو میهرەبانیت".

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا ئەم نزایەی دەکرد:"سبحان الله وبحمده، أستغفر الله وأتوب إليه".

منیش پێم وت:"ئەی پێغەمبەری خوا! دەبینم تۆ (سبحان الله وبحمده) زۆر دەڵێیتەوە، ئەمە لەبەر چییە؟ تۆ پێشتر هەرگیز وات نەدەکرد؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"خوای گەورە پێی ڕاگەیاندووم کە نیشانەیەك لە ئومەتەکەمدا دەبینم، هەرکات ئەو نیشانەیەم بینی دەبێت زۆر زۆر تەسبیحات و حەمدو ئیستغفار بکەم. منیش ئەو نیشانەیەم بینی، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾ النصر: ١ – ٣.

ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت:"عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) هەموو جارێك منی بانگ دەکرد بۆ ئەو مەجلیسەی خۆی کە بۆ ئەو هاوەڵە بەتەمەنانەی ساز دەکرد کە لەجەنگی بەدردا بەشداربووبوون. هەندێکیان ئەمەیان گرتبووە دڵ و دەیانوت:"بۆچی ئەمیش بەشدار دەکەیت لەگەڵ ئێمەدا؟ ئێمە منداڵمان هەیە لەتەمەنی ئەودا دەبێت!".

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:"ئەو کەسێك نیە لەوانەی ئێوە دەیانزانن!".

دیسان ڕۆژێکی دیکە منیشی لەگەڵ ئەواندا بانگ کرد بۆ کۆڕو دانیشتنەکەیان. پاشان بۆم دەرکەوت کەمنی بۆ ئەو مەبەستە بانگ کردبوو کە پیشانی ئەوانم بدات. عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:"ئێوە چی دەڵێن دەربارەی کەلامی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ....﴾.

هەندێکیان وتیان: "لێرەدا فەرمانمان پێ کراوە کاتێ کە خوای گەورە یارمەتی داین و فەتحی بەنسیب کردین، ئێمە دەبێت شوکرو ستایش و تەسبیحاتی خوای گەورە بکەین، هەندێکی دیکەشیان بێدەنگ بوون و هیچیان نەوت".

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بەمنی وت:"ئایا تۆ هەمان شت دەڵێیت؟".

وتم:"نەخێر !".

وتی:"ئەی تۆ چی دەڵێیت؟"

وتم:"ئەوە، ئەجەلی پێغەمبەری خوایەﷺ ، ئەوە بە پێغەمبەری خوا ڕادەگەیەنێت کە ئەجەلی نزیك بووەتەوە".

هەرکاتێك هاوکاری و فەتح هات لەلایەن خوای گەورەوە، ئەوە نیشانەی ئەجەلی تۆیە. ئیتر سوپاس و تەسبیحاتی خوای گەورە بکە و داوای لێخۆش بوونی لێ بکە. گومان لەوەدا نیە کە ئەو تەوبە زۆر قبوڵ دەکات!

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:"ئەوەی منیش دەیزانم هەر ئەوەیە کە تۆ وتت. سورەتی (النصر) بانگهێشتکەرێك بوو لەلایەن خوای گەورەوە، ماڵئاوایی پێغەمبەری خوا بووﷺ، لە ژیانی دونیا".

ئەو ڕۆژەی ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ المائدة: ٣.

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەستی کردە گریان. کاتێک پرسیاری لێ کرد: "بۆچی دەگریت؟"

وەڵامی دایەوە: "ئەمە، ئاماژە بۆ کەم و کورتی دەدات لەدوای کەماڵی! ئەمە وا دەردەکەوێت کە گوزارشت لە وەفاتی پێغەمبەرﷺ بکات!".

ڕۆژێک پێغەمبەری خواﷺ بە نهێنی بە حەزرەتی فاتیمەی فەرموو: "جوبرەئیل هەموو ساڵێک یەك جار دەوری قورئانی پیرۆزی پێ دەکردمەوە. بەڵام ئەمساڵ دووجار دەوری قورئانی پیرۆزی پێ کردمەوە. وادەزانم ئەمە نیشانەی هاتنی ئەجەلمەو مردنم نزیک بووەتەوە!".

جوبرەئیل هەموو ساڵێك لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ قورئانی پیرۆزی دەور دەکردەوە. جوبرەئیل لە ڕەمەزاندا هەموو شەوێ دادەبەزی و قورئانی پیرۆزی لەسەرەتاوە تا کۆتایی لەگەڵ پێغەمبەردا دەوردەکردەوە، بەڵام ڕەمەزانی ساڵی پێش کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ، ئەم دەورکردنەوەیەی دووجار

کرد. پێغەمبەرﷺ لەحەجی ماڵئاواییدا، ماڵئاوایی لە موسوڵمانان کرد.

پاش ئەوەی لە حەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە، لە خوتبەی (غدیر الخم)[1] دا فەرمووی: "خەڵکینە! ئەوە بزانن کە منیش هەروەك ئێوە مرۆڤێکم! زۆر نامێنمەوە، نێردراوی خوای گەورە دێتە لام و منیش بانگهێشتەکەی قەبوڵ دەکەم!".

ڕۆژێك عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: "سوێند بەخوا من دەبێت بزانم پێغەمبەری خواﷺ تا کەی بە ساغی لەناوماندا دەمێنێتەوە!"

چووە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و وتی: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ، دەبینم کە خەڵکی هەم خۆیان نارەحەتیان کردوویت و هەم بە تۆزی پێیان نارەحەتت دەکەن. وا باشتر نیە کە تۆ ساباتێك بۆ خۆت دروست بکەیت، لەوێ دا قسەیان لەگەڵ بکەیت و هەم لە تەپ تۆزی خەڵك، هەم لە دوژمن بتپارێزێت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"وەڵڵاهی، ئەوەندە ناخایەنێت، بانگیان دەکەم. ئەوان عەباکەم لەسەر پشتم لادەبەن و فشار دەخەنە سەر پاژنەم.

---

[1] – ناوی ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەر (د.خ) خوتبەی ئەخیری تیا خوێند، لەبەر ئەم هۆکارەشە خوتبەکە ناونراوە خوتبەی ( غدیر خم)، کە شوێنێکە لە نێوان مەکەو مەدینە.

تـۆزی ئـەوان مـن دادەپۆشـێت. لـە کۆتاییـدا خـوای گـەورە ئاسوودەم دەکات لەدەست ئەوان."

عـەباس (ڕەزای خـوای لەسـەر بێـت) دەڵێـت: تێگەیشـتم کـە پێغەمبەری خواﷺ ماوەیەکی زۆر کەمی ماوە لەناوماندا بمێنێتـەوە. کاتێ نوستم، لە خەومدا بینیم؛ زەوییان توند بە پەت بە ئاسمانەوە بەستبوویەوەو ڕایان دەکێشا.

ئـەم خەونـەم بـۆ پێغەمبـەری خـواﷺ گێڕایـەوە. ئـەویشﷺ فەرمووی: "ئەمە، وەفاتی برازاکەت دەگەیەنیت!"

عەبدوڵلای کـوڕی مەسـعودیش دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری ئـازیزو خۆشەویستمان مانگێك پێش وەفاتکردنی خۆی، پێی ڕاگەیاندین.

لێمان پرسی: "پێغەمبەری خوا، کەی ئەجەلی تۆ دێت؟"

فەرمووی: "ئەجەلم نزیك بووەتـەوە، وا دیـارە گەڕانـەوە بـۆ لای خوای گەورە، بۆ (جنة المـأوی)، (سـیدرة المنتهـی)، بـۆ لای (رفیـق الاعلی)، گەڕانەوە بۆ ژیانێکی خۆش و بەختەوەر نزیك بووەتەوە!"

وتمان: "ئەی پێغەمبەری خوا، کێ لاشەی پیرۆزت بشوات؟!

فەرمووی:"کەسێك لە ئالوبەیت، بە پێی نزیکی، کێ لە هەمووی نزیکتر بوو ئەو بمشوات."

وتمان: "پێغەمبـەری خـوا، ئێمـە لـە چ شـتێکت بپێچـین و کفنـت بکەین؟"

فـەرمووی: "گـەر دەتانـەوێت هـەر لـەناو ئـەم جلانـەم دام بنـێن، یاخود لە قوماشێکی میسریم بپێچن!"

دەسـتمان کـردە گریـان و وتمـان: "ئـەی پێغەمبـەری خـوا، کـێ نوێژی جەنازەت لەسەر بکات؟"

ئەویشﷺ گریاو فەرمووی: "خوای گەورە ڕەحمتان پـێ بکـات! بەهۆی پێغەمبەرەکەتانەوە پاداشتی خێرتان بداتەوە! ئێـوە کـاتێ منتان شت و کفنتان بە بەردا کردم لەسەر ئەم قەنەفەیە لـە لێـواری ئەو گۆڕەی لـەم ماڵەمدایـە دام بنـێن! پاشـان بۆ ماوەیـەك بـەجێم بهێڵن و بچنە دەرەوە.

چونکە پێش هـەموو کـەس، سـەرەتا دۆسـتەکانم و جوبرەئیـل و میکائیـل پاشـان ئیسـرافیل، پاشـانیش فریشـتەی گیـان کێشـان (عزرائیل) لەگەڵ سوپاکەیدا نوێژم لەسەر دەکەن!

پاشان کۆمەڵ کۆمەڵ ئێوە وەرنە ژوورەوە، بەڵام بـە پیاهەڵـدان و هاوارکردن و بانگکردنم ناڕەحـەتم مەکـەن. بـا لـە پێشـدا پیـاوانی ئالوبەیتی خۆم نوێژم لەسەر بکەن، پاشانیش ژنەکانیان.

لە پاش ئەوان ئینجا ئێوە نوێژم لەسەر بکەن.

سەلامم بگەیەنن بەو هاوەڵانەم کە ئێستا لێرە ئامادە نین!

هـەروەها سـەلامی مـن بگەیـەنن بـە هـەموو ئـەو کەسـانەی لـەم ئومەتەی من دەبن و هەموو ئەوانەش کە دەبنە شوێن کەوتووی ئەم دینەی من!"

پرسیارمان کرد:"ئەی پێغەمبەری خوا! کێ تۆ بخاتە ناو گۆڕەکەتەوە؟"

فەرمووی:"کەسەکانی خۆم(ئالوبەیت)، لەگەڵ چەندەها فریشتەی زۆردا کە ئەوان ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن!"

(وابصەی کوڕی ئەسقەع) دەگێڕێتەوە:

پێغەمبەری خواﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان و فەرمووی:

-"ئایا پێتان وایە، کە من وەفاتم کرد، ئیتر دواهەمینتانم؟ باش بزانن کە من وەفاتم کرد، یەکەمینتانم! ئێوە لە شەڕ و دوویەرەکیدا یەکتری لەناو دەبەن و بە کۆمەڵ بە دوای مندا دێن!"

لەلایەن خوای گەورەو مەزنەوە بە پێغەمبەرمانﷺ ڕاگەیەنرا: "بچۆو نزا بۆ ئەو خەڵکەی گۆڕستانی بەقیع بکە!"

پێغەمبەرمان ﷺ ڕۆیشت و ئەم نزایەی بۆ کردن: "ئەی پەروەردگارم، لە خەڵکی گۆڕستانی بەقیع خۆش ببە!"

کاتێ لە گۆڕستانی بەقیع گەڕایەوە، پێی ڕاگەیەنرا:"نزا بۆ شەهیدەکانی جەنگی ئوحودیش بکە!"

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ چوو بۆ ئوحود و نزای بۆ شەهیدەکانی ئوحودیش کرد.

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) پێی ڕاگەیاندوین کە پێغەمبەری خواﷺ شەوێکیان عەباکەی و پێڵاوەکانی داکەندو لای قاچییەوە

داینـا، بەشـێکی عەباکـەی لەسـەر دۆشـەکەکەی ڕاخسـت و ڕاکشـا. پاش ئەوەی کەمێك حەوایەوە بە لەسەرخۆیی عەباکەی هـەڵگرت و، پێڵاوەکـانی لەسـەرخۆ لـە پـێ کـرد، دەرگاکـەی کـردەوە و چـووە دەرەوە، وردە وردە دوورکەوتەوە.

عائیشەش (ڕەزای خوای لێبێت) دەست بەجێ سەرپۆشـەکەی دا بەسـەریداو عەباکـەی دا بەخۆیـداو بـەدوای پێغەمبـەرداﷺ ڕۆیشـت. پێغەمبەر پاش ئەوەی ماوەیەك بە پێوە وەستا، دەسـتەکانی بـەرز کردەوەو ئەم نزایەی کرد:

-"سەلامتان لێ بێت ئەی باوەڕدارانی ئەم (دیـار)ە، ئێـوە پـێش ئێمە کەوتون و ئێمەیش لەدوای ئێوە دێین إن شاءالله!

خوای گەورە، ئێمەیش لەو پاداشتانەی ئەوان بێ بەش مەکە.

لە پاش ئەوان ئێمە مەخە ناو فیتنەو تاقیکردنەوەوە."

پێغەمبەرﷺ ماوەیەك ڕاوەستا، پاشان دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، دوای ئەوەی سێ جار دەستی بەرز کـردەوەو گەڕایـەوە دواوە. پێغەمبەرﷺ بە خێرایی دەستی بە ڕۆیشتن کـرد، عائیشـەش (ڕەزای خوای لێ بێت) بـەخێرایی دەسـتی کـرد بـە ڕۆیشـتن ، پـاش کەمێك پێغەمبەر دەستی کرد بە ڕاکردن، عائیشەش بەهەمان شێوە دەستی کرد بە ڕاکردن.

پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە نزیك بووەوە، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێش پێغەمبەرﷺ گەیشتە ماڵەوەو چووە ناو جێگاکەی ڕاکشا.

پاشان پێغەمبەرﷺ چووە ژوورەوە. کاتێ چووە ژوورەوە بە عائیشەی فەرموو: "ئەی عائیشە، چیتە؟ بۆچی بە گومان بوویت؟"

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: "هیچ شتێك نیە ئەی پێغەمبەری خوا!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "یان خۆت پێم بڵێ یاخود خوای زانا و میهرەبان (کە ئاگاداری هەموو شتێکە) پێم ڕادەگەیەنێت!"

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: "دایکم و باوکم بە قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ بە منی بفەرموو"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "تۆ ئەو ڕەشاییەت بینی کە لە بەردەم مندا بوو؟"

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: "بەڵێ! لە پشتمی دا و گیانی ئازاردام!"

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بەڵێ، جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) هاتە خزمەتم و بانگی کردم کە بەبێ ئاگاداری لە تۆ جودا بیمەوە، منیش ئەوەم قبووڵ کرد کە بەبێ ئەوەی بگەمەلات و بەبێ ئاگاداریت بڕۆم. کاتێك تۆ پۆشاکەکەت دانا، پێم وابوو کە نوستویت. نەمویست بە خەبەرت بهێنم، وتم نەوەك بترسیت.

خوای گەورە فەرمان بە تۆش دەکات کە بچیتە لای خەڵکانی گۆڕستانی بەقیع و داوای لێ خۆش بونیان بۆ بکەیت!"

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی:"ئەی پێغەمبەری خوا، من بچمە ئەوێ بڵێم چی؟"

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:"بڵێ، سەلام و ڕەحمەتی خوای گەورەو میهرەبان برژێت بەسەر هەموو ئەو موسوڵمانانە کە لە پێش ئێمەوە هەروەها ئەو موسوڵمانانەی کە لە پاش ئێمەدا دێن بۆ ئەم شوێنە! إن شاءالله ئێمەیش دێینە ئێرەو بەشدارتان دەبین."

پێغەمبەرﷺ لە کۆتایی شەودا ڕاست چووە گۆڕستانی بەقیع و ئەم نزایەی دەکرد: "سەلام لە ئێوە ئەی موسوڵمانانی ئەم شوێنە، إن شاءالله ئێمەیش دێینە لای ئێوە. ئەی پەروەردگارم، خەڵکی بەقیعی غەرقەد ببەخشە.

ئازادکراوی پێغەمبەری خواﷺ ئەبو نوەیهیبە دەڵێت:

– کاتێك پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێ کرا کە داوای لێخۆش بوون بکات بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە لە گۆڕستانی بەقیع بە خاك سپێردراون، سێ جار بە شەو ڕۆیشت و داوای لێ خۆش بونی بۆ کردن. لە شەوی دووەمدا، پێغەمبەری خواﷺ لە نیوە شەودا پیاوێکی ناردو بانگی منی کرد، پێی فەرمووم:

–"ئەی ئەبو نوەیهیبە، کورتانی ئاژەڵەکەم ببەستە لێ ی و ئامادەی بکە! فەرمانم پێ کراوە بچم داوای لێ خۆش بوون لە خوای

گەورە بکەم بۆ ئەو خەڵکەی کە لە گۆڕستانی بەقیع بە خاك سپێردراون. تۆش وەرە لەگەڵم!"

پێغەمبەری خواﷺ سواری ئاژەڵەکەی بوو، منیش بە پێ لەگەڵی بەڕێ کەوتم. کاتێ گەیشتینە گۆڕستانی بەقیع، لە ئاژەڵەکەی دابەزی و منیش ئاژەڵەکەم گرت.

پێغەمبەری خواﷺ لە ناویاندا ڕاوەستاو فەرمووی:

-"سەلامی خواتان لێ بێت ئەی خەڵکی ئەم گۆڕستانە. ئەوەی ئێوەی تێدان خۆشترە لەوەی خەڵکی تێدایە.

خۆزگە بتانزانیایە کە خوای گەورە ئێوەی لەوە ڕزگار کردووە. شەوانی تاریك وەك شەوی دەیجور بەدوای یەکدا دێن.

ئاشوبی دووایین لە یەکەمین خراپترە، ئەوەی دواتریش لەو خراپترە!"

پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ من و فەرمووی:

-"ئەی ئەبونوەیهیبە، من کلیلی خەزێنەکانی دونیاو مانەوە لە ژیانی دونیاو پاشانیش بەهەشتم پێ بەخشرا.

من لەنێوان ئەمەو گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارم و بەهەشت دوو دڵ مابومەوە. سەربەست بووم لەوەی هەرکام لەمانە هەڵبژێرم.

منیش بەهەشت و گەڕانەوەم بۆ لای پەروەردگاری خۆم هەڵبژارد."

پێم وت: "دایکم و باوکم بە قوربانت بن! ئەی بۆ کلیلەکانی خەزێنەکانی دونیاو لە دونیا مانەوەو، پاشان بەهەشتت هەڵنەبژارد؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "نەخێر، سوێند بەخوا ئەی ئەبونوەیهیبە، من بەهەشت و گەڕانەوەم بۆ لای خوای گەورەم هەڵبژارد".

پێغەمبەرﷺ پاش ئەوەی داوای لێ خۆش بوونی بۆ ئەو موسوڵمانانە کرد کە لە گۆڕستانی بەقیع بە خاك سپێردراون، گەڕایەوە.

عائیشەش (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت:"هەرکات گوێبیستی پێغەمبەر بوومایەﷺ ئەمەی دەفەرموو ڕادەوەستام، وﷺ دەیفەرموو:"هیچ پێغەمبەرێك وەفات ناکات تا سەربەست نەکرێ لەنێوان ئاخیرەت و ژیانی دونیادا."

گوێم لە پێغەمبەر بووﷺ لە کاتێکدا لەسەر جێگا کەوتبوو و بۆری هەناسەی گیرابوو دەنگی گرپبوو بوو و خەریك بوو دوایین هەناسەکانی دەدا، ئەم ئایەتەی لە سورەتی (النساء) خوێندەوە:

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴾ النساء: ٦٩.

واتە: هەرکەس بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکات و لە ئەمریان دەرنەچێت، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا هاوڕێی پێغەمبەران و هی ئەوانەیە کە نەفسیان بەرزبوەتەوە بۆ لوتکەی خوداناسی، هەروەها هاوڕێی ئەوانەیە کە لە ڕێگای ئاینی ئیسلام و ڕەزای خودا گیانیان بەخت دەکەن و شەهید دەبن و، لەگەڵ ئەوانە دەبن کە عومریان لە ئیطاعەی خواوماڵیان لەڕێگای ڕەزامەندی ئەودا سەرف کردووە، ئەمانەیش باشترین و جوانترین هاوڕێن و ئەوەی لەگەڵیان بێت سەرفرازە.

پێم وایە پێغەمبەری خواﷺ ئەو ساتە سەربەستی درابوویە کە ئاخیرەت یان دونیا یەکێکیان هەڵبژێرێت.

هەروەك چۆن پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێکرا بوو لەلایەن خوای گەورەوە کە داوای لێ خۆش بوون بۆ موسوڵمانانی گۆڕستانی بەقیع بکات، بە هەمان شێوە خوای گەورە فرمانی پێ کرد کە داوای لێ خۆش بوون بۆ شەهیدەکانی ئوحودیش بکات.

ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت بۆ کێوی (ئوحود) و، نزای بۆ شەهیدەکانی ئوحود کرد. پاشان گەڕایەوەو چووە سەر مینبەرەکەو وەك ئەوەی ماڵئاوایی لە مردووەکان و زیندووەکان بکات، فەرمووی:

-"من یەکەم کەستانم کە دەگەمە حەوزی کەوسەر و، لەوێدا پێتان دەگەمەوە، فراوانی حەوزی کەوسەر بەقەدەر بەینی ئەیلەو

جوحفە وایە. ئەوە ئەو حەوزەیە کە لەگەڵ ئێوەدا بەیەك شاد دەبینەوە. من شایەتی بۆ ئێوە دەدەم! ئێستا من حەوزەکەم دەبینم. ئێستا من کلیلەکانی زەوی و خەزێنەکانی زەویم پێ بەخشرا.

سوێند بەخوا، من لەوە ناترسم کە ئێوە لەدوای من بگەڕێنەوەلای بێ باوەڕەکان. بەڵام لەوە دەترسم بە دونیاوە ببەسترێنەوەو شەیدای ببن و لەسەر دونیا یەکتری توورە بکەن و یەکتری بکوژن وەك ئەو گەلانەی پێش خۆتان کە لەناوچوون. ئێوەش لەناو بچن و بفەوتێن!"

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لە ماڵی مەیمونە (ڕەزای خوای لێ بێت) مایەوە. ڕۆژێك هەموو خێزانەکانی بانگ کردە لای خۆی. داوای ڕازی بوونی لێ کردن کە ڕۆژانی ئەم نەخۆشی و ناساغیەی لە ماڵی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) بەسەر ببات و و پێی فەرموون:"من سبەینێ لە ماڵی کێم؟"

ئەو شوێنەیان پێ ڕاگەیاند کە دەبوایە سبەینێ لەوێ بێت، هەنێکیشیان وتیان:

-"پێغەمبەری خوا تەنها ئەو ڕۆژەی دەوێت کە لە ماڵی کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەبێت" پاشان بەوە ڕازی بوون وتیان:

-"ئەی پێغەمبەری خوا، حەڵاڵ بێت بۆت. ئێمە هەموو خوشکین (لەم بارەیەوە زویر نابین لەیەکتر)"

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموون:"ئێوە ئەوەم پێ حەڵاڵ دەکەن (کە ماوەی نەخۆشیەکەم لە ماڵی عائیشە بەسەر بەرم)؟

وتیان:"بەڵێ!"

پاشان پێغەمبەری خواﷺ عەباکەی دا بە شانیدا.

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت:"کاتێک پێغەمبەری خواﷺ نەخۆشیەکەی لەسەری قورس بوو و ئازاری زۆر بوو، داوای ئەوەی لە خێزانەکانی کرد کە ئەو ماوەیە لە ماڵی مندا بەسەر ببات و خێزانەکانیشی ڕەزامەندی خۆیان بۆ ئەوە دەربڕی.

پێغەمبەرﷺ لە لایەک عەباس و لە لاکەی دیکەش کەسێکی دیکە هەڵیانگرتبوو، خۆی نەیدەتوانی هەنگاو بنێت. بەو شێوەیە هاتە ماڵی من. کاتێ بینیم کە پێغەمبەرﷺ لە ماڵی مندا دەمێنێتەوە بە پەلە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. ئەوکاتە هیچ خزمەتکارێکیشم نەبوو.

دۆشەکێکم بۆ ڕاخست کە ناواخنەکەی بە ڕیشاڵی دارخورما پڕکرابوو. پێغەمبەرﷺ پاش ئەوەی نەخۆشیەکەی لێی سەخت بوو و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە فەرمووی:

-"حەوت شەربە ئاوم بەسەردا بکەن، لە چەند بیرێکی جیاواز بن. بەڵکو بەوە لەشم سوک بێت و بتوانم وەسیەتێک بۆ ئەو خەڵکە بدەم."

پاشان ئیشارەتی بۆ کردین و فەرمووی: "ئیتر بەسە!"

نەخۆشیەکەی پێغەمبەرﷺ لە مانگی (صەفەر)دا، ڕۆژی چوار شەممە، دوای ئەوەی لە گۆڕستانی بەقیع گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بەسەر ئێشە دەستی پێ کرد.

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەرﷺ لە گۆڕستانی بەقیع گەڕایەوە، بینی منیش سەرم دەئێشا. من هەر دەموت: "ئای سەرم!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "سوێند بەخوا ئەی عائیشە، پێویستە من بڵێم ئای سەرم!"

تا بهاتایە سەر ئێشەکەی پێغەمبەرﷺ بەهێزتر دەبوو.

نەخۆشیەکەی پێغەمبەرﷺ ١٣ ڕۆژ بەردەوام بوو، پێشتریش ئەم نەخۆشیانەی گرتبوو: ژەهراوی بوون، تا و نەخۆشی بوحا (واتە بۆری هەناسەی توند بوو بوو وە دەنگی گڕ بوو بوو، قورگی ناڕەحەت بوو).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ لە کاتی نەخۆشیەکەیدا پێی فەرمووە:

-"ئەی عائیشە! جار جار هەست بە ئازاری ئەو گۆشتە ژەهراویە دەکەم کە لە خەیبەر خواردم. ئێستا وا هەست دەکەم گوێم لە پچڕانی دەماری دڵمە!"

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت:

-"من ئازارو کارتێکردنی ئەو ژەهرەم لەسەر زمانی بچووکی پێغەمبەرﷺ هەست پێدەکرد و دەستەوەستان بووم نەمدەتوانی کارێك بکەم".

دایکی بەشیری کوڕی بەرائیش دەڵێت: کاتێك پێغەمبەرﷺ ئەو نەخۆشیانەی گرتبوو کە بە وەفاتی کۆتایی هاتن، لە خزمەتیدا بووم. ئەوکاتە تای گرتبوو. دەستم هێنا بەنێو چاوانیدا و پێم وت:

-"ئەی پێغەمبەری خوا، دەبینم تۆ تایەکت لێهاتووە کە پێشتر تووشی هیچ کەسێك نەبووە!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەو ئەجرو پاداشتەی بە ئێمە دەدرێت پلە پلەیە، ئیبتیلا و تاقیکردنەوەشمان بە هەمان شێوە پلە پلەیە!".

پاشان پرسیﷺ: "خەڵك لەبارەی ئەم نەخۆشیەی منەوە چی دەڵێن؟"

وتم: "خەڵك دەڵێن: ئەو نەخۆشیەی تووشی پێغەمبەری خوا بوەﷺ (ذاتُ الجنب)[١]ە".

---

[١] - بریتیە لە ئیلتهابی پەردەی دەوری سییەکان، ڕەنگە لەو کاتەدا بەمانای ئیلتهابی سییەکان هاتبێت، کە ئەم نەخۆشیە لەسەرەتاوە لە ئیلتهابی سیەکانەوە پەرەدەسێنێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "خوای گەورە ئەو نەخۆشیەی وەك لەناوبەرێك بۆ نەناردووم. ئەمە تەنها وەسوەسەو فێڵبازی شەیتانە بۆ خەڵکەکە."

وتم: "ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ پێت وایە ئەم نەخۆشیە بۆچی تا بێت بەهێزترو سەختتر دەبێت لەسەرت؟ من پێم وایە مردنی کوڕەکەم تەنها بەهۆی ئەو گۆشتی مەڕە ژەهراویەوە بوو کە لە خەیبەر لەگەڵ تۆدا پێکەوە خواردتان".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەی دایکی بەشیر، منیش هەر پێم وایە ئەم نەخۆشیەم بەهۆی ئەوەوەیە سەختتر دەبێت! ئێستا هەست بە کسپە کسپی دەمارەکانی دڵم دەکەم بەهۆی ئەو گۆشتە ژەهراویەوە کە لەگەڵ کوڕەکەی تۆدا لە خەیبەر خواردمان. جار جار هەست بە ئازارو کسپەی دەکەم!"

فاتمە خاتونی پوری ئەبو عوبەیدەو خوشکی حوزەیفە دەڵێت:

-"کاتێك نێردراوی خوام بینیﷺ دەتوت لە ئاو هەڵکێشراوە هێندە ئارەقی دەردا بوو بەهۆی ئەو تا بەهێزەیەوە."

وتمان: "ئەی پێغەمبەری خوا، بۆ دوعا ناکەیت خوای گەورە شیفات بدات؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "پێغەمبەران لە هەموو مرۆڤەکان زیاتر تووشی بەڵاو تاقی کردنەوەی سەخت دەبن. پاشان بەپێی پلەکانیان، ئەوانەی لەدوای ئەوانەوە دێن."

ئـەبو سـەعیدی خـودریش (ڕەزای خـوای لێبێـت)، سـەردانی پێغەمبەری کردبووﷺ لەکاتی نەخۆشیەکەیدا.

پێغەمبەرﷺ بە سەرچـەفێك داپۆشـرابوو. ئـەبو سـەعید دەستی خستە سـەر سەرچـەفەکەو لـە سەرچـەفەکەوە هەستی بـە گـەرمی لەشی پێغەمبەرﷺ کرد، وتی: "تاکەت چەند بەرزە!"

پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: "بەڵاو موسیبەتی ئێمـە بـەم شـێوەیە سەخت دەبێت، پاشانیش بە قات قات پاداشتمان دەدرێتەوە."

ئەبو سەعیدی خودری وتی: "لە هەموو مرۆڤەکاندا کێ لە هـەموو کەس زیاتر تووشی بەڵاو تاقی کردنەوە دەبێت؟"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "پێغەمبەران!"

ئەبو سەعید وتی: "پاشان کێ؟"

پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: "پیاوچاکان!"

عەبدوڵڵای کوڕی مەسـعود دەڵێـت: کـاتێ تاکـەی پێغەمبـەر زۆر بەرز بوو بووەوە نەخۆشیەکەی سـەخت بـوو بـوو، چـوومە خزمـەت پێغەمبەری خواﷺ. پێم وت: "ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ تایـەکی زۆر بەرزت تووش بووە!"

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بەڵێ تاکەی من هێنـدەی تـای دوان لـە ئێوە بەرزو سەختە!"

وتم: "گومانی تێدا نیە، تۆ دوو پاداشتت هەیە!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "بەڵێ، وایە. هیچ موسوڵمانێك نیە کە نەخۆش بکەوێت و خوای گەورە هەموو گوناه و کەم و کورتیەکانی وەك گەڵای دار هەڵنەوەرێنێت! "

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئیبن عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە: "ڕۆژی پێنج شەممە! ڕۆژی پێنج شەممە چیە؟"

پاشان ئیبن عەبباس دەستی کردە گریان. بینیم فرمێسکەکانی وەك دەنکی مرواری بەسەر ڕومەتیا دەهاتنە خوارەوە.

پێم وت: "ئەی ئیبن عەباس، ڕۆژی پێنج شەممە چیە؟"

ئیبن عەبباس وتی: "ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا نەخۆشیەکەی پێغەمبەرﷺ سەخت بوو! ".

پێغەمبەر ﷺ کاتێك نەخۆش بوو و هەندێ زاتی وەك عومەری کوڕی خەتاب لەماڵەکەیدا بوون، فەرمووی:

-"کاغەز و پێنوسم بۆ بهێنن با نوسراوێکتان بۆ بنوسم، تا دوای ئەوە هەرگیز نەکەونە ناو گومڕایی و تاریکی یەوەو، لەسەر ڕێی ڕاست چەسپاو بن! "

عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:

-"نەخۆشیەکەی پێغەمبەرﷺ سەخت بووە، قورئانی پیرۆزتان لایە. کتێبی خوای گەورە بەسە بۆ ئێمە! "

خەڵکی ناوماڵەکە ناحاڵی بوونێك لەنێوانیاندا دروست بوو، و دەستیان کرد بە مشت و مڕ. یەکێك لە ئافرەتەکان وتی:

-"ئەو شتەی پێغەمبەری خواﷺ داوای کرد، بۆی بهێنن!"

عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:

-"بێ دەنگ بە! ئێوە ژنی ئەون، کاتێك ئەو نەخۆش دەکەوێت چاوی ئێوە ئاو دەکات و فرمێسك دەڕێژن. کاتێکیش لە لەش ساغیدایە دەیخەنە ناڕەحەتیەوە!"

زەینەبی خێزانی پێغەمبەرﷺ وتی:"بۆچی بە گوێی پێغەمبەری خواﷺ ناکەن، کە دەیەوێت پەیمان و وەسیەتێکمان بۆ بنوسێت؟"

یەکێکیش دەیوت:"با ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ دەیەوێت بۆتان بنووسێت، کاغەزو پێنوسی لێ نزیك بکەنەوە! با نوسراوێکتان بۆ بنووسێت تا هەرگیز ڕێی خۆتان ون نەکەن!"

یەکێکی دیکەش دەیوت:

-"قسەکەی عومەر لە جێی خۆی دایە!"

کاتێك نا حاڵی بوون و دەنگە دەنگ و مشت و مڕ لە خزمەت پێغەمبەری خواداﷺ پەرەی سەندو پێغەمبەری خوایان ناڕەحەت کردﷺ فەرمووی:

-"لە لای من هەستن! نابێ لە خزمەت مندا دەمەقاڵێ بکرێت! من بە حاڵی خۆمەوە جێ بهێڵن! ئەم بارو دۆخەی منی تێدام

باشتره لەو شتانەی کە ئێوە منی پێوە سەرقاڵ دەکەن و بانگهێشتم دەکەن بۆی!"

چەند نەگبەتییەکی گەورەیە ئەو نەگبەتیە، کە ناحاڵی بوون و دەمەقاڵێ و مشتومڕەکانیان بووە هۆکاری ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ ئەو نوسراوەیان بۆ نەنوسێت!

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خواﷺ نەخۆشیەکەی لێ پیس کرد، فەرمووی: "ئەی عەلی! ئێسقانی دەفەی شان بهێنە بۆم، با ئەو شتەی تێدا بنوسم کە بەهۆیەوە دوای خۆم، ئوممەتەکەم لەسەر ڕێی ڕاست لانادات".

پێغەمبەری خواﷺ سەری لەنێوان قۆڵم دا بوو. خەمی ئەوەم بوو تا دەڕۆم و دەگەڕێمەوە وەفات بکات، بۆیە پێم وت:

-"ئەوەی دەیفەرموویت من لە مێشکم دا هەڵی دەگرم و لەبەری دەکەم!"

فەرمووی:"ئامۆژگاری ئەوەتان دەکەم کە نوێژەکانتان بکەن، بەردەوام بن لە زەکات دان، مافی ئەو بەندانە بپارێزن کە لە دەستاندان".

فەرمووی: -"أشهد أن لا إلـه إلا الله وأشـهدُ أن محمداً عبده ورسوله" وە فەرمانی بەوەدا کە شایەتمان بهێنن".

پاشان فەرمووی:"ئەو کەسەی شایەتی بەم ڕاستییە بدات، ئەوا ئاگری دۆزەخی لێ حەرام دەبێت".

کاتێك عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هاتە زیارەتی پێغەمبەری خواﷺ ، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو:"لێم نزیك بەرەوە ! ".

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) لەپێغەمبەرﷺ نزیك بووەو خۆی لارکردەوە بەسەریدا، پێغەمبەری خواﷺ بە نهێنی شتێکی پێ فەرموو. کاتێ عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) سەری بەرز کردەوە، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: "تێگەیشتیت لەو شتەی پێم وتیت؟"

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:"بەڵێ! "

پێغەمبەری خواﷺ دیسان پێی فەرموو:"لێم نزیك بەرەوە ! "

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) خۆی نزیك کردەوە لە پێغەمبەری خواﷺ و خۆی لار کردەوە بەسەری دا. پێغەمبەری خواﷺ دیسان بە نهێنی شتێکی پێ فەرموو. کە عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) سەری بەرز کردەوە، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو:"تێگەیشتیت لەو شتەی پێم گوتیت؟"

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:"بەڵێ، گوێم بیستی و دڵیشم لەبەری کرد ! "

دوای ئەمە پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو:"دەی بڕۆ ئێستا ! "

کاتێ پێغەمبەری خواﷺ نارەحەتیەکەی سەخت بوو، بە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری فەرموو:"کاغەزو پێنوسێکم بۆ

بهێنـە، بـا نوسـراوێك بـۆ ئەبوبـەكر بنوسـم (واتـە بـە كەسـێك بڵـێم بینوسێت)، تا بەهۆی ئەوەوە ناحاڵی بوون دروست نەبێت!"

کاتێـك عەبـدولڕەحمان هەسـتا بچـێت كاغـەزو پێنـوس بهێنێـت، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو:

-"دابنیشـە! نـە خـوای گـەورەو نـە موسـوڵمانانیش ڕازی نـابن بەوەی لەسەر ئەبوبەكر ناحاڵی بوون دروست ببێت!"

پاشان بە عائیشەی فەرموو(ڕەزای خوای لێبێت):

-"ئەبوبـەكری باوكـت و براكـەت بانگهێشـت بكـە، بـا نوسـراوێك بنوسـم، (یـەكێك بـۆم بنوسـێت)، چـونكە مـن لـەوە دەترسـم ئارەزوومەندێك ئارەزووی ئەوە بكات و بڵێت:"مـن لـە هـەموو كـەس زیاتر گونجاوم بۆ ئـەم كـارە!" سـەرەڕای ئـەوەی، خـوای گـەورەو موسوڵمانانیش جگە لە ئەبوبەكر بە كەسێكی دیكە ڕازی نابن!"

کاتێك پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەبوبەكرم بۆ بانگ بكەن!"

عومەریان (ڕەزای خوای لێبێت) بۆ بانگ كردبوو.

کاتێك پێغەمبەرﷺ هۆشی هاتەوە بە خۆیـدا، دیسـان فـەرمووی: "ئەبوبەكرم بۆ بانگ بكەن!"

دیسان عومەریان (ڕەزای خوای لێبێت) بانگ كرد.

پێغەمبـەری خـواﷺ فـەرمووی: "ئایـا ئێـوەش هـەروەك دەسـتە خوشكی ژنەكانی سەردەمی (یوسف)ن (سەلامی خوای لێبێت)؟".

## دوايين ئاگاداركردنەوەى پێغەمبەرﷺ چى بوو؟

کاتێك پێغەمبەرى خواﷺ نەخۆش بوو، قسەو گفتوگۆ دەکرا لە خزمەتى دا، ئوم سەلەمەو ئوم حەبیبە (ڕەزاى خوايان لێبێت) باسى ئەوەيان کرد کە لە ولاتى حەبەشە کلێسەيەکيان بينيووە چەند بتێکى تێدا بووە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووى:

-"بەڕاستى ئەگەر کەسێکى باش لە ناوياندا بمردايە، لەسەر گۆڕەکەى پەرستگايان دروست دەکرد و ئەو بتانەيان پێدا هەڵدەواسى، ئەوانە لە ڕۆژى دواييدا لاى خواى گەورە بە خراپترين دروستکراوەکان دادەنرێن!".

پێغەمبەرى خواﷺ پێنج ڕۆژ پێش وەفاتکردنى، لە ٨ ى ڕەبيعى يەکەم لە پێنج شەممەدا فەرمووى:

-"وريابن! ئەوانەى پێش ئێوە لەسەر گۆڕى پێغەمبەرو پياوچاکانيان مزگەوت و پەرستگايان دروست دەکرد. هەرگيز نەکەن ئێوەش گۆڕەکەى من بکەنە مزگەوت و پەرستگا!"

من ئێوە لەوە قەدەغە دەکەم! لەعنەتى خوا لە جولەکەو نەصرانى چونکە قەبرى پێغەمبەرەکانيان دەکردە پەرستگا. خواى گەورە ئەو قەومە لەناو بەرێت کە قەبرى پێغەمبەرەکەى دەکاتە

پەرستگا ! لەناو نیمچە دوورگەی عەرەبیدا، لەسەر خاکی عەرەبدا دوو ئایین جێگای نابێتەوە (تەنها یەك ئایین دەمێنێتەوە).

خوای گەورە دەتوانێت لە گشت تاوانەکان خۆش بێت، جگە لە کەسێك کە بە بێ باوەڕی بمرێت و کەسێك بە ناهەق موسوڵمانێك بکوژێت.[1]

## دوایین وتارو ئامۆژگاری پێغەمبەرﷺ بۆ موسوڵمانان چی بوو؟

حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێت)، بەلای کۆڕێك لە کۆڕەکانی (ئەنصار)دا تێپەڕ بوو بوون. کاتێ گریانی ئەنصارەکانیان بینی، لێیان پرسین: "بۆچی دەگرین؟".

وتیان: "ئەو ڕۆژانەمان کەوتەوە یاد کە لە خزمەت پێغەمبەری خواداﷺ بووین".

حەزرەتی ئەبوبەکرو حەزرەتی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێت) هاتن و ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خواﷺ گێڕایەوەو پێیان وت:

-"ئافرەتان و پیاوانی ئەنصار لە مزگەوتەکەدا دەگرین!"

---

١- پێشەوا ئەبو داود ڕیوایەتی کردوە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەوان بۆچی دەگرین؟"

وتیان:"لەوە دەترسن کە تۆ بمریت!"

لەوکاتەدا، فەضلی کوڕی عەباس هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو:"دەستم بگرە!"

ئەویش دەستی پێغەمبەری گرتﷺ. پێغەمبەری خواﷺ عەبایەکی گەورەی لە خۆی پێچاو خۆی داپۆشی و عەمامەیەکی خۆڵەمێشی لەسەر بەست و لەسەر مینبەرەکە دانیشت. ئەمە دوایین دانیشتنی پێغەمبەر بووﷺ لەسەر مینبەر، دوای ئەم ڕۆژە، پێغەمبەری ئازیزﷺ هەرگیز نەچووەوە سەر مینبەر.

کاتێك چووە سەر مینبەرەکە بە فەضلی کوڕی عەباسی فەرموو:"بانگی خەڵك بکە!"

کاتێ فەضلی کوڕی عەباس خەڵکی بانگ کرد، هەموو موسوڵمانان لە مزگەوت کۆبونەوە. مزگەوت بە موسوڵمانان پڕ بوو بوو.

پێغەمبەری ئازیزﷺ دوای ئەوەی شەهادەتی هێنا، دوایین وتاری خۆی بۆ خەڵك خوێندەوە...

## پێغەمبەری خواﷺ لە دوایین وتاریدا بۆ خەڵك باسی لەکام بابەتانە کرد؟

سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو فەرمووی: "خەڵکینە، من سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکەم ، کە جگە لە ئەو هیچ خوایەکی دیکە نیە بۆ ئەو نیعمەتەی بە ئێوەی داوە!".

هەروەها وەك هەموو جارێکی دیکە داوای لێ خۆش بوونی بۆ ئەو موسوڵمانانە کرد کە لە جەنگی (ئوحود)دا شەهید بوون.

پاشان فەرمووی:"ئەی خەڵکینە، نزیکم ببنەوە!"

موسوڵمانان هاتن بەرەو پێغەمبەرﷺ و ئەویش فەرمووی:

-"خەڵکینە، من بیستوومە ئێوە خەمتانە و لەوە دەترسن کە پێغەمبەرەکەتان وەفات بکات، هیچ پێغەمبەرێك پێش من هەبووە کە لەناو ئوممەتەکەیدا هەتا هەتایە مابێتەوە، تا منیش بۆ هەتا هەتایە لەناوتاندا بمێنمەوە! باش بزانن کە من بە پەروەردگاری خۆم شاد دەبم! ئێوەش هەر دەگەڕێنەوە بۆ لای! ئامۆژگاری ئەوەتان دەکەم سەرەتا لەگەڵ موهاجیرەکاندا باش بن و ئەوانیش لەناو خۆیاندا بەرامبەر بە یەکتری باش بن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَالْعَصْرِ ۝١ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ۝٣ ﴾ العصر: ١ – ٣.

واتە: (قەسەم بە چەرخی زەمان! بەڕاستی هەموو ئادەمزاد ژین بەخەسارو زەرەرمەندن. تەنها ئەوانەیان نەبێ ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووەو یەکترییان ڕاسپاردووە بیروباوەڕو گوفتارو ڕەفتاریان ڕاست و دروست بێ‌و، یەکترییان ڕاسپاردووە لەبەرانبەری گوناها خۆیان بگرن و نەیکەن، یا کە لە ڕێی خوادا تووشی دەردو بەڵا هاتن خۆیان بگرن.)

پاشان فەرمووی: "گومانی تێدا نیە کە هەموو شتێك و هەموو کارێك بە فرمانی خوای گەورە بەڕێوە دەچێت. پەلەکردنتان لەو شتانەدا کە دوا دەکەوێت هیچ شتێك بەدەست ناهێنێت! چونکە خوای گەورە بە پەلەکردنی هیچ کەسێك پەلە ناکات!".

ئەوانەی هەوڵ بۆ ژێرخستنی پەیامی خوا دەدەن، خوای گەورە ژێریان دەخات و لەناویان دەبات، ئەوانەش زیانمەند دەکات کە هەڵدەستن بە هەڵخەڵەتاندنی کەسانی تر.

﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴾ محمد: ٢٢.

واتە: دەی ئاخۆ لەوانەیە ئەگەر پشتتان لە جێبەجێکردنی فەرمانی غەزاکردن هەڵکرد بکەونە وێرانکاری‌و ڕیشەو ڕەچەڵەکی خۆتان بنبڕبکەن؟

هیچ پێغەمبەرێك وەفاتی نەکردووە کە دوای خۆی کۆمەڵێکی جێ نەهێشتبێت. منیش ئەنصارەکانم لەناو ئێوەدا جێ هێشتووە.

ئامۆژگاری ئەوەتان دەکەم کە لە خوای گەورە بترسن و بەرامبەر بە ئەوان بە باشی هەڵسوکەوت بکەن! ئێوە دەزانن کە ئەوانە ماڵ و سامانی خۆیان لەگەڵ ئێوەدا بەش کرد! لەکاتی نارەحەتی و لەکاتی خۆش گوزەرانی و ئیسراحەتیشدا ئەوان یارمەتیان داون و باش بوون لەگەڵتاندا!! مافی ئەوان لەبەرچاو بگرن! چونکە ئەوان لە پێش ئێوەدا (مەدینە)یان کردە ماڵ و لانەی باوەڕو بەرامبەر بە ئێوەی موهاجیرەکان بە باشی مامەڵەیان کردووە! ئایا ئەوان میوەو بەرو بوومەکانیان لەگەڵ ئێوەدا بەش نەکرد! ئایا ئەوان لە ماڵەکانیاندا جێ و شوێنیان بە ئێوە نەدا؟ ئایا ئەوان نەبوون کە سەرەڕای ئەوەی خۆشیان موحتاج بوون ئێوەیان پێش خۆیان خست؟

ئەی کۆمەڵی موهاجیرەکان! وەسێتتان بۆ دەکەم چاك بن لەگەڵ ئەنصارەکاندا! چونکە ئەوان پشت و پەنای منن، ئەوەی لەسەریان بوو کردیان، ماوەتەوە ئەوەی کە پێویستە پێیان بدرێت، چاکەی چاکەکاریان قبوڵ بکەن، چاوپۆشی بکەن لە خراپەی خراپەکارانیان.

خەڵك زۆر دەبن، ئەنصارەکان کەم دەبنەوە، تا وەکو خوێی چێشتیان لێ دێت، ئەگەر هەرکەسێك لە ئێوە کارێکی کەوتە دەست و توانی زیان بگەیەنێت بە کەسێك یان قازانجێکی پێ بگەیەنێت،

ئەوا چاکە لە چاکەکارەکانی ئەنصار قبوڵ بکات و چاوپۆشی لە خراپەی خراپەکارەکانیان بکات.

ئەوە بزانن کە من پێش ئێوە دەڕۆم و چاوەڕێتان دەکەم! ئێوەش دێن و بە من دەگەنەوە. وریا بن! ئەو شوێنەی تێیدا بەیەك دەگەینەوە حەوزی کەوسەرە.

ئەوەی دەیەوێت سبەی بە من شاد بێتەوە، با دەست و زمانی لە گوناح و تاوان بپارێزێت.

خەڵکینە، گوناه و تاوانەکان دەبنە هۆی گۆڕانی نیعمەتەکان. کاتێ خەڵك باش بن، فەرمانڕەواکەیشیان باش دەبێت. کاتێکیش خەڵك خراپ بوون، ئەوا فەرمانڕەواکەیشیان خراپ دەبێت، سوێند دەخۆم بەو زاتەی کە ژیان و گیانی منی لە دەستدایە، ئا لەم شوێنەمەوە سەیری حەوزەکەم دەکەم!

بەندەیەك، خوای گەورە ڕای داوەتە دەست خۆی لەوەدا کە گوڵێکیماڵی دونیا بەخواستی خۆی هەڵگرێت، لەگەڵ ئەو نازو نیعمەتەدا کە لای خۆی (الله) هەیە، ئەو بەندەیەش بێ گومان ئەوەی هەڵبژاردووە کە لای خوای گەورەیەو ئاخیرەتی هەڵبژاردووە.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) تێ گەیشت لەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ باس لە خۆی دەکات. لەو کۆڕەدا هیچ کەس

جگە لە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لـە مەبەستی پێغەمبـەرﷺ تێ نەگەیشت!

حەزرەتی ئەبوبەکر دەستی کرد بە گریان. چاوەکانی پڕبوون لـە فرمێسك، بە گریانەوە وتی:

– "باوك و دایکمان دەکەینە قوربانی تۆ، ئەی پێغەمبەری خوا! بە گیان و سەرو ماڵ و منداڵمانەوە خۆمان دەکەینە قوربانت"

کـاتێ موسـوڵمانان لـە مزگەوتەکـەدا ئەبوبـەکریان بینـی دەگریا وتیان:

– "ئێمە سەرمان سوڕماوە لەوەی کە ئەبوبەکر دەگری، لەکاتێکدا پێغەمبەری خواﷺ هەواڵی بەندەیەکمان پێدەدات کە خـوای گـەورە ڕای داوەتــە دەسـتی لـەوەدا گـوڵێکی دونیـایی پــێ داوەو لـەنێوان ئــەوەی کــە لای خــوای گەورەیــەو ئــەویش لای خــوای گــەورەی هەڵبژاردووە!"

بەڵام ئەوە بـوو کـە ئەبوبـەکر لـە مەبەسـتی وتـەکانی پێغەمبـەرﷺ لەوان باشتر تێگەیشت.

ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: من لە دڵی خۆمدا وتم:

"باشە بەندەیەك ڕای دراوەتە دەستی لەوەی کە گـوڵێکی دونیـا هەڵبژێرێت و لـەنێوان ئـەوەدا کـە نـازو نیعمەتـەکانی خـوای گـەورە هەڵبـژێرێت، ئـەویش ئـاخیرەت و لای خـوای گـەورەی هەڵبـژاردووە ئەوە چی تێدایە وا ئەبوبەکر دەگری؟!"

پـێم وت:"تـۆ بۆچـی دەگریـت بـەوەی کـە بەندەیـەك لـەنێوان گوڵێکی دونیا و نازو نیعمەتی لای خـوای گـەورەدا، ئـاخیرەت و لای خوای گەورەی هەڵبژاردووە؟".

ئەڵبەت ئەو بەندەیەی کە ڕای خۆی دراوەتە دەسـت لەلایـەن خـوای گەورەوە پێغەمبەری خـواﷺ یـە، بـەڵام ئـەبو بـەکر لـە ئێمـە باشـتر ئەوەی دەزانی.

پێغەمبەری خواﷺ تەماشای ئەبوبەکری کرد (ڕەزای خوای لێبێت) و فەرمووی:"ئەی ئەبو بەکر مەگری!"

پاشان فەرمووی:"خەڵکینە، متمانە پێکراوترین کەسێك لای مـن لە هاوەڵێتی ماڵ و ساماندا ئەبوبەکرە، خۆ ئەگـەر مـن جگـە لـەخوا خۆشەویستێکی دیکـەم هەڵبژاردایـە ئـەوا ئـەبو بـەکرم هەڵدەبژارد، بەڵام برایـەتی و خۆشەویسـتی لـەناو ئیسـلامدا لەسـەرو ئەمەوەیـە. چاك بزانن کە هاوەڵەکەتان دۆستی خوایە. هەموو ئـەو دەرگایانـەی کە دێنە سەر مزگەوت دایخەن، تەنها دەرگـای ئەبوبـەکر نـەبێت، بـا ئەو کـراوە بێـت! مـن لەسـەر دەرگـای ئـەبو بـەکرەوە ڕووناکییـەك دەبینم و، لەسەر دەرگاکانی دیکە تاریکی دەبینم!

لەکۆتاییدا منیش هـەر مـرۆڤێکم! دەشـێت مـافی هەنـدێك کـەس لـەلای ئێـوە کەوتبێتـە لای مـن. مـن لـەماڵی هەرکەسـێکم بردبێـت، بابێت ئەویش لەماڵەکەی من ببیات! باش بـزانن کـە لـە پێشـترین و خۆشەویسترین کەستان لای من ئەو کەسەیە کە ئەگەر مافێکی لای

من هەبێت لێم وەربگرێتەوە یاخود گەردنم ئازاد بکات، چونکە بەهۆی ئەوەوە (بەهۆی ئەوەی گەردنی ئازاد کردووم) بەبێ خەمی و دڵخۆشی بە پەروەردگارم شاد دەبم!

هیچ کەسێك ناتوانێت بڵێت :"دەترسم لەوەی لەناخیدا قین و دوژمنایەتی دروست ببێت بەرامبەرم".

باش بزانن کە ڕواندن و هەڵگرتنی قین و دوژمنایەتی لەناودڵدا لە خورەوشت و ڕەفتاری من نیە!

-"من باکم نیە لەوەی لەناوتاندا بوەستم و ئەم وتەیەتان بۆ دووبارە بکەمەوە".

پاشان وتەکانی لەبارەی قین و دووبەرەکیەوە دووبارە کردەوە. کابرایەك هەستایە سەرپێ و وتی:"من سێ درهەمم لای تۆیە. کاتێك یەکێك داوای لێ کردی تۆ فرمانت پێدام کە سێ درهەمی بدەمێ، منیش پێمدا!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ڕاست دەڵێیت! ئەی فەضلی کوڕی عەباس، سێ درهەم بدە بەم کابرایە!"

پاشان نزای کردو فەرمووی:"پەروەردگارم! من تەنها مرۆڤێکم! ئەگەر من بەرامبەر بە هەر موسوڵمانێك قسەیەکی ڕەق و زبرم کردبێت، یان قامچییەکم لێدابێت، یاخود نەفرەتم لێ کردبێت، ئەوا تۆ ئەوە بکە مایەی پاکبوونەوە و پاداشت و گەیشتن بەڕەحم و بەزەیی بۆی".

-"پەروەردگارم! من بەرامبەر بە هەموو موسوڵمانێك قسەیەكی زبرم كردبێت، ئەوا تۆ لەڕۆژی دواییدا بۆی بكە بە هۆكاری ئەوەی لەخۆتی نزیك بكەیتەوە!".

-"خەڵكینە! هەركەسێك مافێكی بەسەرەوەیە با یەكسەر بیداتەوە! با نەڵێت لەدونیادا ڕسوا دەبم! باش بزانن كەڕسوا بوون لە دونیادا ئاسان و سوكترە لە ڕسوا بوون لەڕۆژی دواییدا".

دوای ئەم قسەیە، كابرایەك هەستایە سەرپێ‌و وتی:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ من خیانەتم لە دەستكەوتی جەنگێك كردووە كە لەپێناوی خوای گەورەدا بەرپاكراوەو سێ درهەمم لای خۆم گل داوەتەوە!".

پێغەمبەری‌خواﷺ فەرمووی:"تۆ بۆچی ئەم خیانەتەت كردووە؟"

پیاوەكە وتی:"پێویستم پێی بوو!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەی فەضلی كوڕی عەباس، سێ درهەم لەم پیاوە وەربگرەو بیخە خەزێنەی (بیت المال)ەوە".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"خەڵكینە! ئەگەر هەركەسێك لەئێوە هەیە لە نەفس و ئارەزووی بترسێت با هەستێتە سەرپێ، تاوەكو نزای بۆ بكەم!".

كابرایەك هەستایە سەرپێ و وتی:"ئەی پێغەمبەری خوا، من چرووك و ترسنۆكم و زۆر دەخەوم! لەخوای گەورە بپاڕێرەوە ئەو چرووكی و ترسنۆكی و زۆر خەوتنەم لەسەر لاببات!".

پێغەمبەری خواﷺ نزای بۆ کرد. پاشان پیاوێکی دیکە هەستایە سەرپێ‌و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، من زۆر درۆزنم! دەم پیس و کردەوە ناشیرینم! هەروەها زۆریش دەخەوم!"

پێغەمبەری خواﷺ نزای بۆی کردو فەرمووی: "پەروەردگارم، ڕاستگۆیی و کامڵ بوونی باوەڕی بەنسیب بکە! کاتێك خەوی هات، خەوی بزڕێنە!"

دوای ئەوە کابرایەکی دیکەش هەستایە سەرپێ و وتی: "سوێند بەخوا، ئەی پێغەمبەری ئازیز منیش زۆر درۆزنم، هەروەها دووڕووشم! هیچ خراپەیەك نیە کە ئەنجامم نەدابێت!"

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) پێی وت: "ئەی پیاو تۆ خۆتت سووك و ڕسوا کرد!".

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ فەرمووی: "ئەی کوڕی خەتاب! ڕسوای دونیا لە ڕسوایی ڕۆژی دوایی ئاسانترو سووکترە!".

پاشان نزای بۆ پیاوەکە کردو فەرمووی: "پەروەردگارم، ڕاستگۆیی و کامڵ بوونی باوەڕی بە نسیب بکە! ئەو کارە خراپانەی دەیکات، بیگۆڕە بۆ کارو کردەوەی چاك!"

دوای ئەوە ئافرەتێك هەستایە سەرپێ‌و وتی: "ئەی پێغەمبەری خواﷺ من فلانە هەڵسوکەوتم هەیە! نزام بۆ بکە لای خوای گەورە کە ئەو هەڵسوکەوتانەم نەمێنێت!"

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: "تۆ بڕۆ بۆ ماڵی عائیشە!"

پاشان له مینبەرەکە دابەزی. کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵی عائیشـە، گۆچانەکەی خستە سەر سەری ئافرەتەکەو نـزای بـۆ کـرد. عائیشـە (ڕەزای خوای لێبێت) وای دەگێڕێتەوە کە کاریگـەری ئـەو نزایانـەی پێغەمبەری خـوامﷺ لەئافرەتەکـەدا بینـی، تەنانـەت پـێش ئـەوەی لەلای هەستێت و بڕوات.

## بۆچی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ویستی دەرگاکەی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بەکراوەیی جێ بهێڵرێت؟

دەرگای ماڵەکانی دەوروبەری مزگەوت جگە لەدەرگای ئەبوبـەکر (ڕەزای خوای لێبێت) داخران. عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خـوای لێبێت) وتی: "ئەی پێغەمبـەری خـواﷺ ، دەرگاکـەی مـن جێبهێڵـەو دایمەخە، با تەماشات بکەم کاتێك دەردەچیت بۆ نوێژکردن! "

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "نەخێر! "

عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) وتـی: "ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ، بۆچی دەرگای پیاوەکانت بۆ مزگەوت داخست؟"

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "ئەی عـەباس، مـن نـە لەخۆمـەوە کردمنەوەو نە لەخۆشمەوە دامخستن! ".

## ئەو دوایین نوێژەی پێغەمبەری ئازیزﷺ لەماڵەوە کردی چۆن بوو؟

کاتێك پێغەمبەری خواﷺ ناساغ بوو، دوایین نوێژ کە کردی نوێژی (مەغریب) بوو.

خێزانی عەباس (ڕەزای خوای لێبێت)، دایکی فەضلی کچی حارس دەڵێت: "پێغەمبەری خواﷺ ، جلەکانی پۆشی و سورەتی (المرسلات) ی خوێندو نوێژی مەغریبی بۆ خەڵك کرد. دوای ئەوە تا ڕۆژی دوایی هەرگیز نوێژی بۆ خەڵك نەکردەوە. (واتە پێش نوێژی بۆ خەڵك نەکرد پاش ئەوە)".

## پێغەمبەری ئازیزﷺ دواهەمیین ساتەکانی ژیانی چۆن بەسەربردو دوا خواستی چی بوو؟

لەدوانزە یاخود سیازدەی مانگی ڕەبیعی یەکەم، لە ڕۆژی دووشەممەدا، کاتێك ڕۆژ بەرەو خۆرئاوابوون دەڕۆیشت (هەندێك دەڵێن لە چێشتەنگاودا بووە!) ، پێغەمبەری خۆشەویستمان دوایین ساتەکانی ژیانی بەسەردەبرد. پێغەمبەرﷺ سەری لەسەر ڕانی عائیشە بوو عائیشەش بەردەوام هیوای شیفای بۆ دەخواست و دەیوت: "ئەی پەروەردگاری هەموو مرۆڤەکان! نەخۆشیەکەی

لەسەر لابەرە. پزیشك و چارەسەری ڕاستەقینە تۆیت. هەر تۆ شیفا دەبەخشیت!"

پێغەمبەری خوایش ﷺ بەردەوامی بە نزاکانی دەداو دەیفەرموو:"نەخێر! من خواستی ئەوە دەکەم بگەڕێمەوە بۆ لای (رفيق الأعلى)و لەگەڵ جوبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیلدا بم! خوایە بمخەیتە ڕیزی ئەوانەی نازو نیعمەتت بەسەردا ڕشتن لە پێغەمبەران و سالّحان و شەهیدان، خوایە لێم ببورە و ڕەحمم پێ بکە، خوایە (رفيق الأعلى) خوایە (رفيق الأعلى).

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت:"کاتێك پێغەمبەرﷺ لە لەش ساغیدا بوو، ئەو ساتانە زۆرجار دەیفەرموو: هیچ پێغەمبەرێك گیانی ناکێشرێت تا وێستگەی خۆی لە بەهەشت نەبینێت! دوای ئەوە ڕۆیشتن بۆ ئەو وێستگەیەی لەدەستی خۆیدا دەبێت (هەڵی دەبژێرێت)!".

کاتێك خۆیشی نەخۆش کەوت و ساتی گیان کێشانی هات، سەری لەسەر ڕانم دانابوو، بێئاگاییەك هات بەسەریدا. کاتێك بە هۆشی خۆیدا هاتەوە، چاوی بڕییە سەقفی ماڵەکەو فەرمووی:"خوایە بەرەو (رفيق الأعلى)م بەرە، خوایە (رفيق الأعلى)".

ئەوکاتە من وتم:"پێغەمبەری خواﷺ ئێمە هەڵنابژێرێت!"

تێگەیشتم ئەمە هاتنەدی ئەو هەواڵەیە کە پێغەمبەری خواﷺ کاتی خۆی کە تەندروست بوو هەمیشە پێی دەوتین.

## لەسەردانی جوبرەئیلدا (سەلامی خوای لێبێت)

## بۆ لای پێغەمبەری ئازیزمانﷺ چی ڕووی دا؟

سێ ڕۆژ پێش هاتنی ئەجەلی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ، لە یەکەم ڕۆژدا جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) هات و لە پێغەمبەری ﷺ پرسی:"ئەی ئەحمەد! خوای پەروەردگار بۆ ڕێزلێنانی تۆ منی ناردووە. لەکاتێکدا کە ئەو لە تۆ باشتر لە بارودۆخت ئاگادارە. لێت دەپرسێت. خۆت چۆن دەبینیتەوە؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەی جوبرەئیل! خۆم زۆر بە لاوازی دەبینم! ئەی جوبرەئیل! خۆم زۆر لەئەزیەت و ناڕەحەتیدا دەبینم!".

لەڕۆژی دووەمدا، دووبارە جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) دابەزی و فەرمووی:"ئەی ئەحمەد! خوای پەروەردگار بۆ ڕێزلێنانی تۆ منی ناردووە. لەکاتێکدا کە ئەو لە تۆ باشتر لەبارودۆخت ئاگادارە، لێت دەپرسێت:"خۆت چۆن دەبینیت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەی جوبرەئیل! زۆر هەست بە لاوازی دەکەم! ئەی جوبرەئیل! هەست بە ناڕەحەتی و ئەزیەتێکی زۆر دەکەم!".

کاتێك سێیەم ڕۆژ (ڕۆژی دووشەممە) هات، جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) دابەزی. فریشتەی گیان کێشانیش (عزرائیل) لەگەڵیدا دابەزی بوو. جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی:"ئەی ئەحمەد! خوای پەروەردگار بۆ ڕێزلێنانی تۆ منی ناردووە. لەکاتێکدا کە ئەو لە تۆ باشتر لەبارودۆخت ئاگادارە، لێت دەپرسێت:"خۆت چۆن دەبینیت؟".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەی جوبرەئیل! هەست بە لاوازییەکی زۆر دەکەم! ئەی جوبرەئیل! هەست بە ناڕەحەتی و ئەزیەتێکی زۆر دەکەم!".

پاشان فریشتەی گیان کێشان (عزرائیل) داوای مۆڵەتی کرد کە بێتە ژوورەوە! جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی:"ئەی ئەحمەد! ئەوە فریشتەی گیان کێشانە. داوای مۆڵەتت لێ دەکات تا بێتە ژوورەوە بۆ خزمەتت. لەکاتێکدا کە ئەو پێش تۆ هەرگیز داوای مۆڵەتی لە هیچ نەوەیەکی ئادەم نەکردووە بۆ چوونە لای! وە لە پاش تۆ هەرگیز داوای مۆڵەت لە هیچ نەوەیەکی ئادەم ناکات بۆ چوونە لای! مۆڵەتی بدەرێ تا بێتە ژوورەوە!".

فریشتەی گیان کێشان هاتە ژوورەوەو لەبەردەم پێغەمبەری خۆشەویستداﷺ ڕاوەستاو فەرمووی:"ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەی ئەحمەد! خوای گەورە منی بۆ خزمەتی تۆ ناردووەو فرمانی پێ کردووم کە گوێڕایەڵی هەر فرمانێك بم کە تۆ پێم دەدەیت! ئەگەر تۆ بتەوێت گیانت دەکێشم! ئەگەریش بتەوێت گیانت لای خۆت بەجێدەهێڵم!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەی فریشتەی گیان کێشان، بەڕاستی تۆ وادەکەیت؟".

فریشتەی گیان کێشان فەرمووی:"من فرمانم پێ کراوە کە گوێڕایەڵی هەر فرمانێك بم کە تۆ دەیدەیت لەو بارەوە!".

جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی:"ئەی ئەحمەد! خوای گەورە بیرت دەکات و موشتاقتە!".

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:"ئەوەی لای خوای گەورەیە باشترەو هەتا هەتاییە! ئەی فریشتەی گیان کێشان! دەی ئەوەی فرمانت پێکراوە ئەنجامی بدە! گیانم بکێشە!"

پێغەمبەری ئازیزﷺ دەستی پیرۆزی خۆی کردە ناو قاپە ئاوەکەی لە تەنیشتی بوو وە دەستەکانی تەڕکردو هێنای بە ڕووخساری موبارەکیدا و فەرمووی:"لا إله إلا الله! ئەی خوایە مردنیش چەند دوودڵیو ساتەو ساتی سەختی هەیە!".

پاشان دەستی بەرزکردەوەو چاوی بڕییە بنمیچی ژوورەکەو بەدەم وتی:"خوایە گیان بە ڕەفیقی ئەعلا، خوایە ڕەفیقی ئەعلا" وە دەستی شل بوو و گیانی پاك و پیرۆزی سپارد و گەیشتەوە بە ڕەفیقی ئەعلا.

اللّهُمَّ صَلي عَلى نَبِيّنا وَسَيِدِنا مُحَمّدٍ وَعَلى آلِهِ وأصْحابِهِ وَسَلِّم!

جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی:"سەلامی خوات لێبێت ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە دوواهەمین جارم بوو کە پێ بنێمە سەر زەوی بۆ لای تۆ!".

بەرگێکیان دا بەسەر پێغەمبەری ئازیزداﷺ و لەدەوری دانیشتن و دەگریان.

خەڵکی ماڵی پێغەمبەرﷺ لەوکاتەدا بێ ئەوەی هیچ کەسێك ببینن یان هەست بە کەس بکەن گوێیان لێ بوو سەرەخۆشییان لێ دەکرا و سەلامیان لێ دەکراو دەوترا:"سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای گەورە بەسەرتاندا بڕژێت!".

دوای وەفاتی پێغەمبەری نازدارمانﷺ، خاتوو فاتیمەی کچی کە نوقمی ئازارو پەژارەیەکی زۆربوو دەیوت:

"چواردەوری ئاسمانەکان تۆزاوی بوون

خۆر لێڵ بووەو تیشکەکەی لەدەست داوە

تاریکی شەو ڕۆژی ڕووناکی لەتاریکیدا ناشت

ســـەر ڕووی زەوی لـــەتاو خەفـــەت و پەژارەیـــدا بـــۆ
پێغەمبەرﷺ بووەتە بارستیەك لە لم ..
با شارەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا تێبگەن و بۆی بگرین!
با هۆزی (مضر)و هەموو تیرەکانی یەمەن بۆی بگرین!
با شاخە بڵندەکان و دەشتە پان و بەرینەکان و ماڵی
خواو ڕووکنەکانیشی بۆی بگرین!
ئەی خاتەمی پێغەمبەرەکان (باوکە گیان)!
صەلات و سەلامی ئەو خوایەت لێبێت کە فورقانی بۆ
دابەزاندیت!"

خاتوو فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) پاش ئەوەی کەمێك خۆڵی سەر گۆڕی پێغەمبەریﷺ هەڵگرت و بۆنی کردو هێنای بەچاویدا، وتی:"دەبێت حاڵی ئەوە چی بێت کە بۆنی خاکی (ئەمەد) دەکات؟ بەدرێژایی تەمەنی بۆنی خۆش ناکات. من بەڵاو موسیبەتێکی وام بەسەردا هاتووە، ئەگەر بەسەر ڕۆژگاردا بهاتایە ئەوا دەیکردە شەوی تاریك!".

# ئەحمەد گوربوز

نووسەر لە ناحیەیەکی بچووکی شاری قەیسەری، لە ساڵی (١٩٦٩)دا چاوی بە دونیا هەڵهێناوە.

لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە لە ئەستەنبول نیشتەجێ بووە. ئێستا خێزاندارەو باوکی سێ منداڵە.

ئەم نووسەرە دوو ئەلبومی بەناوی (ئەی ڕێبوار) و (قیامەت) هەیە کە لە تەلەفیزیۆنی (مارمارا میوزیك) بڵاوکرایەوە.

لە ساڵی (٢٠٠١- ٢٠٠٤) لەگەڵ (ئادەم ئۆزبای) گۆڤاری (ڤوسڵەت) یان دەرکردووە.

هەروەها کتێبێکی بە ناوی (گرفتەکانی پەروەردەکردنمان) هەر لەگەڵ (ئادەم ئۆزبای) ئامادەی چاپ کردووە.

ئێستاش لە چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاردا وتارەکانی بڵاودەکرێتەوە.

# پێڕست

## یەك كاتژمێر گفتوگۆ لەگەڵ

# پێغەمبەری ئازیز ﷺ

لەو ڕۆژەوەی دونیا بەدیهێنراوە، بەنرخترین وتەی مرۆڤ، وتەکانی ئەوە. بریقەدارترین و شیرینترین و ئارامی بەخشترین وتە لە زاری پیرۆزی ئەوەوە هەڵوەریون و دڵە ڕەش بووەکانی مرۆڤەکانی ڕووناك کردووەتەوە.

ئەو چاوەی ئەو نەبینێت خۆی بە نابینا و، ئەو گوێیەی دەنگی ئەوی نەبیستبێت خۆی بە کەڕو، ئەو ژیرییەی لێی تێنەگەیشتبێت خۆی بە نوقسان زانیوە. گیانێك کە لەسەردەمی ئەودا نەژیابێت، هەناوی بە داخێکی قوڵەوە قوڵپ دەدات، بە ئاوازەکانی حەسرەت و غەریبی ئەوەوە ئەویندار بووە.

لەم کتێبەدا ئێمە خەیاڵێکمان دروست کردووە. لەو خەیاڵەداو لە گەشتێکدا کە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ کردوومانە، فەرموودەکانی ئەومان لەسەرچاوە ڕاستەکانەوە کۆکردۆتەوە.

ئەوانەی کە دەیانەوێت لەگەشتێکی یەك کاتژمێری ئاوێزان بە هەست و پڕ ژانست لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەربچن. بانگهێشتیان دەکەین بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە..

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center

نرخی (٣٠٠٠) دینارە